# فیقهی بانگەواز

## لەژێر رۆشنایی
## قورئان و سوننەت دا

نوسینی: پڕفیسۆر.د. عەلی قەرەداغی
وەرگێڕانی: محمد محمد حمە میرزا

**بەرهەمی نوسینگەی راگەیاندنی**
**پڕۆفیسۆر. د. عەلی قەرەداغی**
**بەهاری 2012**

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: فیقهی بانگەواز لەژێر رۆشنایی قورئانو سوننەتدا

نوسەر: پرۆفیسۆر.د. عەلی محێدین قەرەداغی

وەرگێڕانی: محمد محمد حمه میرزا

پێداچونەوەی: عومەر عەلی محمد

تایپ: ئەحمەد قادر ئەحمەد

چاپی یەکەم: بەهاری 2012

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

بەرگ: فەرهاد فایەق

وێب سایت:

https://aliqaradaghi.net/

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (1533 )ی ساڵی( 2012) پێدراوە**

## پێڕست

## پێشەکی

لەو کاتەوەی خوای گەورە ئادەمو حەوای لەسەر زەوی د کردە بەجێنشینو لەدوای ئەوەش نەوەی جۆر بەجۆریان لیّ کەوتەوە، هەرلەیەکەم مرۆڤەوە کەئادەم پێغەمبەر بووە ، بەپێویستی زانیوە کەبەردەوام پەیوەست بن بەپەیامی خواوە، لەبەرئەوە بەدرێژای چاخە مێژوویەکان مرۆڤ دانەبڕاوە لەپەیامی ئاسمانو خوای گەورە بەردەوام ڕێنمایی کردووەو پێغەمبەرانی بۆناردووە، بۆئەوەی بەردەوام پردێکی پەیوەندی لەنێوان خواو مرۆڤدا هەبێت.

ئەوکاتەش کەپێغەمبەران لەئارادا نەبوون، بانگخوازان ئەو ڕۆڵەیان بینیوەو جارێکی تر پەیامەکەیان بەخەڵك گەیاندووە، ئیسلامیش وەك کۆتا پەیام لەدوای کۆچی دوای پێغەمبەری خۆشەویست﴿ﷺ﴾بانگخوازان هەستاون بەلەخۆ گرتنی ئەو بەرپرسیارێتیە، لەسەرەتادا پێغەمبەری خواو هاوەڵانی ئەو ڕۆڵە پرشنگدارەیان بینیو خەڵکیان لەنەفامیو نەزانیو تاریکی رزگارکرد بەرەو روناکیو زانستو هۆشیار بوونەوە بانگیان کردن، ئەم پەیامە بووە هۆی ئەوەی کەگەلێکی دواکەوتوی وەك عەرەب بکات بەنەتەوەیەکی خاوەن شارستانیەت و پێشکەتوو، پێغەمبەرو هاوەڵانی توانیان لەڕێگەی ئەم پەیامەوە ئەزموونێکی سەرکەوتوی مێژوویی نیشانی هەموو گەلانی جیهانی بدەن.کە نمونەبێت بۆ لێبوردەیی و چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ و دادپەروەری .....هتد

ئەوان بەقوربانیی دانو ڕاستگۆییو دادپەروەریو ئازادی توانیان ئیسلام بکەنە ئەو پەیامەی کەهەموو گەلە ستەمدیدەکان بەوپەڕی خۆشەویستیەوە باوەشی بۆ بکەنەوەو گەلی کوردیشمان یەکێك بووە لەو گەلانەی کەخۆویستانە مسوڵمان

بوونی خۆیان ڕاگەیاندوو لەئێستاشدا ئیسلام لەلایان خۆشەویست ترە لە هەموو شتێك.

ئاشنا بوونی گەلە ستەم دیدەکان بەئیسلام لەڕێگەی بانگخوازان و هاوەڵانەوە بوو، هەر لەژێر سایەی ئەم پەیامەشدا هەموو گەل و نەتەوەکان کۆبوونەوەو بوون بەبراو بوونە یەك جەستەو لەکاتی هەر ئازارێکدا هەستیان بەئازاری یەکتر دەکرد، بەڵام لەدوای ئەوەی کەژیان گۆڕانی بەسەردا هاتو تەکنەلۆژیا پێشکەوتو چەندان ئایدۆلۆژیای جۆراو جۆر دروست بوون، وردە وردە خەڵك لەسەرچاوە چاکەکەی ئیسلام کەقورئانو فەرموودەیە دورکەوتنەوە، دەرونی مسوڵمانان روویان لەنەخۆشی کردو وردە وردە ئیمانیان لاوازبوو، زۆربەیان سەرقاڵی ئارەزوەکانیان بوونو کەوتنە شوێن پلانو نەخشەکانی دوژمنان، بەمەش مسوڵمانان پارچە پارچە بوونو کەوتنە دژایەتی یەکتر، بەم هۆیەشەوە ڕەگەز پەرستیو فاسشیەتو دوژمنایەتی لەنێوانیاندا گەشەیان کرد، چەندان دەسەڵاتی ستەمکار جڵەوی حوکمیان بەدەستەوە گرت، لەڕووی خاكو نیشتیمانەوە پارچە پارچەبوونو پاشان هەریەکەیان کەوتنە دژایەتی ئەوی تر ئەمە لەسەر ئاستی گشتی ئوممەت.

لەسەر ئاستی تاکیش مسوڵمان روویان لەلاوازی کرد، کەوتنە شوێن پلانو داواکانی شەیتانو بەناوی پێشکەوتنو مەدەنیەتو مودێرنیزم کەوتنە وازهێنان لەپابەند بوون بەبنەما ئیمانیەکان و وایان راگەیاند کە پابەند بوون بە ئاینەوە دەبێتە مایەی دواکەوتنو توندڕەویو فاسشیەتو ڕەگەز پەرستی.

هەروەها لەبواری ئابوریشدا، سوو کرایە بنەمای گەشەپێدانو پێشکەوتنو زیناو مەی خواردنەوەش وەك ئازادیەکی تاکەکەسی لێك درایەوەو فەرمان کردن

بەچاكەو ڕێگرتن لەخراپە كرایە هۆكاری دەست وەردان لەكاروباری تایبەتی تاكەكان.

بەم هۆیەشەوە زۆرینەی كۆمەڵگە مسوڵمانەكان بەتایبەت گەنجان رویان كردە ئارەزوو پەرستیو خۆ دزینەوە لەپابەند بوون بەبنەما ئیمانی و ئیسلامیەكان، دەسەڵاتیش بەكاری عیلمانیەتو پێكشەوتن لەجیاتی هەر ڕێسایەكی شەریعەت، بنەمایەكی دەستوریو یاسایی هێنراوی لە ڕۆژئاواوە هێناو لەدامو دەزگا ئیداریو سیاسییەكاندا چەسپاندی.

لەبەرئەوە ئەمڕۆ لەهەموو كاتێكی تر پێویست ترە كە زانایانو شارەزایانو پسپۆڕان لەباوەڕدارانی مسوڵمان لەئاستی گشتیو تایبەتیدا جارێكی تر گرنگی بدەنەوە بەبواری بانگەوازو هەریەكە لەو كەسانە بەئەركو بەرپرسیاریەتێكی سەرشانی خۆی بزانێت، پڕۆفیسۆر دكتۆر عەلی قەرەداغی لەچوارچێوەی ئەم كتێبەدا دەیەوێت ڕۆڵی گرنگی بانگەوازمان پێ بناسێنێت و بەشێوەیەكی زانستی راڤەی فیقهی بانگەوازمان بۆ بكات .

بانگكردن بۆ ڕێبازی خوا یەكێكە لەپێویستیەكان ئەم سەردەمەو پێویستە زانایانی مسوڵمان بەشێوەیەكی نویو دامەزراوەیی خۆیان ئامادە بكەن بۆ ئەم بەرپرسیارێتیە، بواری بانگەواز لەم سەردەمەدا نابێت دابراو بێت لەوپێشكەوتنە تەكنەلۆژیو زانستەیەی كەئێستا لەسەر ئاستی جیهاندا هەیە، مرۆڤی بانگخواز دەبێت كەسایەتیەكی شارەزاو پسپۆڕو لێهاتووبێت دەبێت شارەزابێت لەبوارەكانی پێشكەوتنی فیكرو زانستو تەكنەلۆژیا لەسەر ئاستی جیهان، نابێت دابڕاوبێت لە گۆڕانكاریە نوێیەكانو بەرهەمە نوێیەكانی شارستانیەتی جیهانی، لەهەمان كاتدا دەبێت سود لەهەموو هۆكارە تەكنەلۆژیەكانی وەك

بواری ئینتەرنێت و کۆمپیتەرو کاسێت و CD و کتێب و گۆڤارەکان و کۆڕو سیمینارو کەناڵەکانی راگەیاندنی جۆراو جۆری بیستراو بینراو نوسراو وەربگرێت، لەم کتێبەدا دکتۆر قەرەداغی دەست نیشانی هەموو ئەو بوارە گرنگانە دەکات و بەپێویستی دەزانێت کەبانگخوازە نوێیەکان گرنگی باش پێ بدەن.

بواری بانگ خوازی لەم سەردەمەدا زۆرجار تێکەڵ بەبواری سیاسی بوەو ئەمەش بوەتە هۆی لەکەداربوونی، چونکە سیاسییەکان نەیانتوانیوە وەك بانگخوازێك مامەڵە بکەنو بەهۆی لاوازیشیان لەبەردەم پۆست و بەرژەوەندیدا هەندێك جار بونە هۆی ئەوەی نمونەیەکی ناجۆر بۆ ئیسلام تۆمار بکەن، بانگخوازەکان هەتا دەکرێت نابێت خۆیان تێکەڵ بەبواری سیاسەتو بەرژەوەندی خوازی بکەن، بەڵکو دەبێت ئەوان وەك کەسایەتیەکی سەربەخۆ بناسرێنو هەرکارێکیش کەلەبواری بانگەوازدا بیکەن دەبێت تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خوابێت نەك دەستکەوتنی پۆستو پلەو پایە، بانگخوازەکان دەبێت نمونەی راستگۆییو پاکی بنو هەموو کارەکانیشیان تەنها لەبەرخواو لەپێناو لێخۆشبوونی خوای گەورەدا بێت، لەم کتێبەدا دکتۆر عەلی قەرەداغی زۆرجەخت دەکاتەوە لەسەر پاراستنی کەسایەتی مرۆڤی بانگخوازو دە لێت پیویستە مرۆڤی بانگخواز بەشێوەیەك مامەڵە بکات کەببێتە نمونەی مرۆڤێکی ڕاستگۆو حەق بێژوو خاوەن رەوشتی گەورە، چونکە ئەمە تەنها ڕێگایە، بۆ ڕێنمای کردنی خەڵكو هەر لەم ڕێگەیەشەوە دەبێت بانگەشە بۆ لای ئیسلام بکەین.

عومەر عەلی محمد

ئایاری2012

# پوختەی فیقهی بانگەواز

خوای گەورە لەچوار ئایەتدا[1] قورئانی پیرۆزی بە چاککەرەوەو سارێژکار بۆ مرۆڤەکان ناوبردوە، بە چاککەرەوەو بەزەیی بۆ باوەڕداران، چاککەرەوەو سارێژکاری ئەو دەردە دەروونیانەیە کەلە سنگی مرۆڤەکاندان.

لێرەوە بانگخوازی خوایی ئەو کەسەیە کە دەرمانی سارێژکار دەدات بەوکەسانە کەنەخۆشیەکانی دڵ و دەروونو رەفتاریان هەیە، ئیتر ئەوکەسانە هەرکەس بن لەخەڵکی و لەباوەڕداران، بانگخواز وەك ئەو پزیشکە بلیمەتە وایە کە درو ست چارە سەری نەخۆ شەکان دە کات، لەڕوونی تێڕا مان و سەرنجدانە حاڵی بانگکراوەکەو چۆنێتی چارە سەرکردنو پ ێدانی جۆری چارە سەرەکەو ئەو دەرمانەی کە دەیداتێ تا بەڕێك و پێکی بەکاری بهێنێت، بۆ یە دەب ینین کە ئەگەر بانگخواز کەسێکی دڵسۆزو پسپۆڕو بەرچاو روون و داناو رێنماکار بێت، کەسێکی نەرم و نیانو مەبە ستدارو ئاما نجدار ب ێت، ئەوا خوای گەورە سەرکەوتووی دەکات و لەبانگەوازەکەیدا سەری دە خات هاو کات - بەماناو بەشایان بوون - فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾دەچەسپێ بە سەریدا کە دەفەرموێ (خوای گەورە هەر دەردێکی ناردبێتە خوارەوە، ئەوا شیفای سارێژ کاریشی بۆ ناردوە)[2] وەفەرمویەتی ﴿ﷺ﴾: (هەموو دەردێ دەرمانی خۆی هەیە، جائەگەر دەرمانەکە دەردەکەی پێکا ئەوا بەویستی خوای گەورە ئەو

---

[1] سورةتی یونس/57، سورەتی النحل /69، سورەتی الاسراء / 82، سورەتی فصلت/44.

[2] البخاری وفتح الباری/10، 5678

دەردەدارە چاك دەبێتەوە)[3] هەروەها لەفەرمودەیەكی تردا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾دەفەرموێت (خوای گەورە هیچ دەردێكی نەناردوە تادەرمانی شیفا كاریشی بۆ نەناردبێ، ئیتر ئەوكەسەی دەیزانێ ئەوا دەیزانێ و ئەوكەسە شی نایزانێ، ئەوا هەر نایزانێ)[4]

## پێناسەكردنی ناونیشانی باسەكە

ناونیشانەكە دوو وشە لەخۆ دەگرێت كەئەمانەن: (فیقە)، (الدعوة - بانگەواز) مانای فیقە لەزمان و لەقورئانی پیرۆزو لەسوننەتدا.

فیقە لەزماندا: تێگەیشتن، بەلاَم بەلێكۆڵكاریو وردە كاری بریتیە لە: تێگەیشتنی قولّو وردو زرنگ، كەسی فیقهیش بریتیە لەزانای زرنگ و وریا[5] یان زانای كۆششكارو راپەسەند(مجتهد)، یان بەپێی ماناكردنی زانایانی فیقە و ئوسولّی واتە ئەو زانایە كەهەلّێنجان دەكات لەراكاندا[6] فیقە تەنها ئەوە نییە كەزانا بێت و بەس لەبەرئەوە دەبینین قورئانی پیرۆز وشەی فیقهی بەومانایە بەكارهێناوە كە بریتیە لە تێگەیشتنی قولّ و وردو زرنگ ئامێز، راغیبی ئەسفەهانی دەلّێت[7]: (فیقە بریتیە لەگەیشتن بەزانستێكی ناددیار بەهۆی زانستێكی دیارو لەبەرچاوەوە، فیقهیش تایبەت ترە لەزانست، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ **فَمَا لِهَـؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً** ﴾النساء78،

---

[3] مسلم/ 4/ 69، واحمد/335/3

[4] احمد/ 278/3، الترمزی/2038/4،وابو داود/3855/4

[5] القامس المحيط، ولسان العرب، والمعجم الوسيط مادة (فقه)

[6] الكوكب المنير – تحقيق د. محمد الزحيلی، ود. نزية حماد/ (نشر جامعة الملك عبدالعزيز 40/1-42)

[7] المفردات دار المعريفة بيروت، ل (384)

واتە ئەوە ئەو خەڵکە چیانە والە گوفتاری خوای گەورە تێناگەن. زاراوەی (فیقە) لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەی رانەبردوو(مضارع) بەتاك و بەكۆ (20) جار هاتووە).

لەو ئایەتە پیرۆزانەش فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ **وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ** ﴾الإسراء44، ﴿**قَالُواْ يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيراً مِّمَّا تَقُولُ**﴾هود91، ﴿ **وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ**﴾المنافقون7.

جائەگەر وردبینەوە لەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەوا دەبینین کە زاراوەی (فیقە) لەم ئایەتانەدا لەمانایەکی زیاتر لەزانست بەکارهاتووە، بۆ نموونە لە سورەتی المنافقون دا کاتێ قورئان باسی مەسەلە غەیبیەکان دەکات دەبینین کە تەنها خوای گەورە خۆیەتی کەخاوەن‌و مۆڵکداری گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوییەو بەدوای ئەم مانایەشدا دەفەرموێ: ﴿**وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ** ﴾المنافقون7 ، چونکە ئەم مەسەلەی غەیبە پێویستی بەوە هەیە وردبونەوەو سەرنجدان و بیرخستنەگەڕ هەبێت کەخوا خۆی بەدیهێنەری گەردوونە، موڵکداری هەموو گەنجینەکانە، کەواتە پێغەمبەرو ﴿ﷺ﴾ هاوەڵە بەرێزەکانی بێبەش دەکرێن لێی ئەمە لەکاتێکدا کە و شەی زانست لەو کاروبارە دیارو بەر چاوانەدا بەکاردەهێنرێ لەئایەتەکەی تردا کە راستەوخۆ دوای ئەم ئایەتەوە دێت کە باس لەدووڕووەکان دەکات کە وتیان: ﴿**لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ** ﴾المنافقون8واتە: عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەللول (منها) واتە: لەمەدینەی پیرۆز (الاذل) واتە پێغەمبەر پەنا بەخوا. بۆیە خوای گەورە بەدوای ئەم گوتەیاندا دەفەرموێت: ﴿ **الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا**

**يَعْلَمُونَ﴾المنافقون8** واتە: ئەوانە هیچ شتێکیان پیێ نەماوە تەنانەت زانست و زانا بوون بەو شتەی کە دیارو لەبەرچاو و روون و دیارە، چونکە ئەوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بوو کە تاکە سەرکردەو پێشەوای مەدینەیەو خاوەنی بڕیارو فەرمانە بەچاکەو رێگیری کارە لەهەرشتیێ نەیەوێت، ئیتر ئەوانە چۆن چۆنی دەڵێن بە (الاذل) وەسفی دەکەن.

لێرەوە دەڵێین ئەم دوو ئایەتەی سەرەوە بەڵگەن لەسەر ئەوە کەفیقە لە شتێکدا بەکاردێ کە پێویستی بەتێڕامانو تێگەیشتن و وردبونەوەو قوڵ داچوونە، بەلاٚم زانست بۆ شتیێ بەکاردێ کە دیارو لەبەرچاو بێت. خوای گەورەش زاناترە.

زانایانی سەردەمە دواینیەکانیش زاراوەی (فیقە) یان بەوە پێناسە کردوە کە: (زانست بوونو شارەزا بوونە بە بەڵگە شەرعیە کرداریەکان کە ئەوانیش لەبەڵگە وردەکارو درێژەکانەوە وەردەگیرێن)[8]

مەبەست بەوفیقهە کە دراوەتە پاڵ (بانگەواز - الدعوة) مانا زمانەوانیەکەیەتی، واتە: تێگەیشتنی قوڵ لە بانگەواز: بەوشەو بەنوسین، بەکردارو بەرەفتار، بەمەبەست و هۆکارو ئامانج، بەبانگەوازو بانگکراوەوە، وەزانست بوون و شارەزا بوون بەو هۆکارانەی کە وادەکەن لەبانگەواز کاریگەری خۆی لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ هەبێ.

## بانگەواز لەزمان و لەقورئانی پیرۆزدا:

بانگەواز لەزماندا چاوگی (مصدر) بانگی کرد (دعا)یە، وە بەمانا داخوازیو داواکردنو هاوار بۆ بردن، دەوترێت: پیاوەکە بانگی کرد، واتە: داوای کرد،

---

(8) شرح الكوكب المنير (1/40-42)

وەبەمانای لێخوڕین دێ، دەوترێ: داوای لەو شترەکە کرد مەلی رێ بگرێ، وەبەمانای ناولێنان دێ، دەوترێت: بەناوی زەیدەوە بانگی دەکرد، واتە: ناوی نا (زەید)، وەبەمانای پاڕانەوە دێت، دەوترێ: بۆی پاڕایەوە بە چاکە، دوعای خراپەی بۆ کرد، یان بەمانای گریان دێت، وەبەمانای پاڕانەوە دێت، خوای گەورە دەفەرمویت: (**واخر دعواهم/یونس**/10)، وە بەمانای واجب بوونی مافە لەسەر کەسێکی تر[9]

راغیب ئەسفەهانی لەپاش باس کردنی هەندێ لەو مانا زمانەوانیەی کە لەپێشەوە لەسەر وشەی (دعوة) هێناویەتی دەڵێ: دوعایش وەك بانگکردن وایە بەلاّم ئەوەندە هەیە کە بانگکردن (النداء) بڕگەی (یا) یان (أ یا) دەکەوێتە پێشەوە، یان شتێکی نزیك لەو مانایە بەبێ ئەوەی ناو بدرێتە پاڵی، بەلاّم بە دەگمەن وشەی دوعا (الدعاء) بوترێ، لەحاڵەتێکدا نەبێت کەناوێك بدرێتە پاڵی.... دەکرێ هەریەك لەم دووانە (الدعاء، النداء) لەجێگای یەکدا بەکاربهێنرێت، دوعایش بۆ شتێ بۆ گەیشتنە بەومەبەستە: (قال رب السجن/ یوسف/33) بەکورتی: ماناکانی بانگی کرد (دعا) و داتا شراوەکانی تری لەقورئاندا بەدەوری مانا زمانەوانیەکانیدا دەسوڕێتەوە.

[9] القاموس المخيط، لسان العرب، الكيان لاتى البقاء، المعجم الوسيط – وشەی (دعو)

# فیقهی بانگەواز

مەبەست بەم زاراوە ئاوێتەیە (فیقهی بانگەواز): تێگەیشتنی وردە لەبانگکراو و لەو هۆکارە کاریگەرانە کە دەبنە هۆی گەیاندنی ئیسلام  وەك بیرو باوەڕو شەریعەتو بەرنامەی ژیان بەلایەنی بەرامبەر.

مەبەستیش بە تێگەیشتنی ورد بریتیە لە: زانست و شارەزا بوون بە ئیسلام بە حەقیقەتی راستەقینەی خۆیو بەمەبەستو ئامانجو هۆکارەکانیشی. هاوکات دەرك کردنو پەی پێ بردنی قووڵ بە سەرەنجامی کارەکان، هەروەها شارەزا بوون بەسروشتی بانگکراو و هۆکارەکانی بانگەواز بەباشترینو تەواوترین شێوە.

مەبەستیش بەلایەنی بەرانبەر لێرەدا هەموو کەسێکە کە پێویستی بەوەیە بانگەوازی پێ بگات جائەگەر ئەوکەسە کەسێکی بێ باوەڕ (کافر) بوو، ئەوا بەحیکمەتو بەدانایی تەواوی ئیسلامی پێ دەگەیەنرێت، وە ئەگەر کەسێکی مسوڵمانی گوناهکار یان ستەمکار بوو ئەوا هەر پێویستی بەوەیە بانگەوازەکەی پێ بگات بۆ ئەوە رێگری لێبکرێت لەگوناهکردن و خراپەو ستەم کردن، وەئەگەر مسوڵمانێکی باش و پاپەند بوو بە ئیسلامەوە ئەوا ئەویش هەر پێویستی بەوە هەیە ئەو بانگەوازەی پێ بگات تازیاتر بیری بخرێتەوەو باوەڕی زیاد بکات و بکەوێتە پەرەبەخۆدانو گەشەکردنو بەرزبونەوەلەهەموو بوارەکانی ژیاندا تاوەکو پێشکەوتوو بێتو دواکەوتوو نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت**لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ**المدثر37، واتە هەر کەس

لەئێوە دەیەوێت باپێش بکەوێت بەرەو چاکەکاری و گوێڕایەڵی یان ئەوەی نەوێت دەبا دوابکەوێ، نەیفەرمووە یان بابوەستێ، چونکە وەستاندن دواکەوتنی تەواوە لەجیهانی چالاکی نواندنی بەردەوام.

کەوابوو بانگەواز ئارا ستەی هەر هەمووان دەکر ێت، مە سوڵمانو غەیرە مسوڵمانانیش، بائیتر شێوازو جۆری گەیاندنی ئەوبانگەوازە بەمسوڵمان جیاواز بێت لەو شێوازەی کە بەغەیرە مسوڵمان دەگەیەنرێت.

بەو ئوممەتەیش کەغەیرە مسوڵمانە دەوترێت ئوممەتی بانگەواز بەو سیفەتە کە پێویستە بانگەوازی ئاراستە بکرێت، بەئوممەتی ئیسلامیش دەوترێت ئو مەتی وەلاٚمدەرەوەو بەدەمەوە چوون ئەویش بەو سیفەتەیە کەهاتووە بەدەم بانگەوازی ئیسلامو یەکتاپەرستیەوەو پەسەندی کردوە، بەلاٚم هەربەردەوام پێویستی بەوەیە بڕوات بەچاکەکاریو پارێز گاری ز یاترو پەرە بەخۆدانو گە شەکردنو بەدەم فەرمانی جێنشینیو ئاوەدانکرد نەوەی زەو یەوە، بەم جۆرە ئەوا هەموو مرۆڤایەتی لەراستیدا ئوممەتی بانگەوازن، هەروەك خوای گەورە دە فەرموێت: ﴿**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ**﴾**الأنبياء**107، واتە: ئێمە(مەبەست خوای گەورەیە) تۆمان - واتە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾- رەوانە کردوە تاببیـ تە رە حم و بەزەیی بۆ هەموو جیهانیان.

ئەوەندە هەیە دەبێت ئەم ئوممەتە ئەوە بزانێ کە دەبـ ێت بانـ گەوازو گەیا ندنی ئیسلامو یەکتاپەرستی بەگوفتارو بەکردارو بەپێشەنگی چاكو بەهەر هۆکارێکی تریش بکرێت کەکاریگەری ئەرێی لەسەر بانگکراوەکە هە یە تاجێ گای خۆی بگرێت.

## تایبەتمەندیەکانی بانگەوازی ئیسلام

دەکرێ تایبەتمەندیەکانی بانگەوازی ئیسلام کورت بکەینەوە لەم چەند دێڕەدا:

بانگەوازی ئیسلام بانگەوازێکی خواییەو لەپێناوی خوادایە، بەهیچ جۆرێ رەوا نیە بەرژەوەندی دنیای تێ بکەوێتو تێکەڵی بکرێت، ئەمەیش پێویستی بەوەیە کەچارەسەر پێشکەش بەنەخۆشەکان بکرێت بەبێ وەرگرتنی هیچ کرێو بەرانبەرێکی تر، لێرەوە دەبینین کەدروشمی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەمە بووە کە: ﴿ **قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً** ﴾ **الأنعام**90، واتە لەسەر ئەم بانگەوازەم بۆتان داوای هیچ کرێیەکتان لێ نا کەم، خوای گەورە فەرمانی بەموحەممەد پێغەمبەری خۆی ﴿ﷺ﴾ کردوە تا بەقەومەکەی بڵێ:(**قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ**) ، هەرئەمە لەسورەتی الشوری دا دووبارە دەبێتەوە، دەفەموڕێت: ﴿ **قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى** ﴾ **الشورى**23، لەسورەتی سبأ دەفەرموێت: ﴿ **قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ** ﴾ **سبأ**47 هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ** ﴾ **القلم**46.

قورئانی پیرۆز هەرلەشێوەی هەمان گوتەی پێشوو لەسەر زمانی ژمارەیەك لە پێغەمبەرانەوە دەگێڕێتەوە، بۆ نمونە لە نوح پێغەمبەرەوە ( سەلامی خوای لەسەر بێت) باوکی پێغەمبەرانە دەگوێزێتەوە کەفەرمویەتی: ﴿ **وَيَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ وَمَا أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّهُم مُّلاَقُو**

**رَبِّهِمْ وَلَـكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْماً تَجْهَلُونَ** هود29. واته: ئەی قەومەکەی من لە سەر ئەم بانگەوازەم بۆتان داوای هیچ سامانێکتان لێ ناکەم بەڵکو پاداشتی من لای خوای گەورەیە، لەسورەتی یونسیشدا هەر لەشێوەی هەمان گوتە لەسەر زمانی نوح(سەلامی خوای لەسەر بێت) دووبارە دەبێتەوە کە فەرمویەتی **فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ** يونس72. واتە: ئەگەر ئێوە پشتان لە بانگەوازەکە هەڵکرد ئەوا من هیچ جۆرە داواکاریەکی کرێ و پاداشتم لەسەرتان نەبووە پاداشت و کرێی من لای خوای گەورەیەو فەرمانم پێکراوە لەریزی مسوڵماناندا بم، لەسورتی الشعرائیشدا گوتەیەکی هاوشێوەی ئەم گوتەیە لەسەر زمانی هود پێغەمبەرەوە( سەلامی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە بەقەومەکەی قەومی عادی فەرمووە: **يَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي أَفَلاَ تَعْقِلُونَ** هود51.

واتە:"ئەی قەومەکەم من هیچ کرێیەك لەسەر ئەم بانگەوازەم لەئێوە داوانا کەم بەڵکو کرێو پاداشتی من لای ئەو خوای گەورەیەیە کە بەدیهێناوم ئیتر بۆ بیرێك ناکەنەوە". لەسورەتی الشعرائدا هەمان گوتە لەهود پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت) هاتوە کەفەرمویەتی: **وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ** الشعراء127.

هەر بەهەمان شێوە صالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) گوتەیەکی هاوشێوەی گوتەکەی هود پێغەمبەر بە قەومی سەمود فەرموو: **وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ** الشعراء145. هەروەها لوگ بە قەومەکەی فەرموو: **وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ** الشعراء164. هەورەها شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لە سەر

بێت) هەمان گوتەی بەقەومەکەی خۆی فەرموو: **﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾الشعراء**180.

لەم ئایەتە پیرۆزانەی پێشەوە ئەوە دەردەکەوێت کە دەبێت بانگەواز بۆلای خوای گەورە دوور بێت لەهەر سودمەندیەکی دنیاییو لەبەشی حەزی دەروونی، دەبێت ئەو بانگەوازە بەهیچ جۆر بۆ کۆکردنەوەی سامان نەبێت، بۆ دەست خستنی پلەو پایەوشۆرەت نەبێت، بەڵکو دەبێت تەنها بۆ دەستخ ستنی رەزامە ندی خوای گەورە بێت، دەبێت ئەو بانگەوازە پەسەندی خوای گەورە بێت، نابێ لەرێگای بانگەوازەوە دنیاپەرستی بکرێت، چونکە هەرکات خەڵکی ئەمەیان زا نی کە بانگخواز دەیەوێت بە بانگەوازەکەی کرێو سامانو پلەوپایەی دەست ب کەوێت ئەوکات کەسایەتیەکەی لەلایان عەیبدار دەبێتو سەرەنجام ئەوپێشەنگیو نموونە کاریگەرەی کە هەیبوە نامێنێو لەدڵیاندا دەسڕێتەوە.

بەجۆرە بانگەواز بۆلای خوای گەورە بەهەموو هۆکارە گوفتاریو کرداریەکانیەوە - لەنێوانیشیاندا جیهاد کردن- ئەوا مەرجی ق بوڵ بونی لای خوای گەورە ئەوەیە کەتەنها لەبەرخواو بۆخوای گەورە بێت، نەك بۆ پەیداکردنی هەژموونو زاڵبون بێت، یان بە حەزو ئارەزووی دەستخستنی سامان یان فەرمانڕەوایی یان پلەوپایە بێت، لەبەرئەوە خوای گەورە تێکۆشانو جەنگی - الجهاد والقتال - لەتەواوی ئایەتە پیرۆزەکاندا بەوە مەرجدار کردوە، تەواوی بان گەوازی بەوەوە مەرجدار کردوەو بەستویەتی بەوەوە کە دەبێ (لەپێناوی خوادا بێت)، ئەمەیش لەزۆربەی ئایەتەکاندا هاتووە، وەك دەفەرموێت: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ، تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾الصف**10-11 . واتە:

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە با پەلکێشتان بکەم بۆسەر بازرگانیەك کە ڕزگارتان بکات لەسزای بەئێشو ئازار، باوەڕ بەخوای گەورەو بەپێغەمبەرەکەی بهێننو بەماڵو سامانو گیانتان تێبکۆشن لەپێناوی خوادا چونکە ئەگەر ئ ێوە پێبزانن ئەوچاکترینی کارە بۆتان. وە فەرمودەی: ﴿**الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ**﴾**النساء**76. واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو باوەڕدارن لەپێناوی خوای گەورەدا دە جەنگێن، ئەوانەیش کەبێ باوەڕن لەپێناوی شەیتانو ستەمکارە ملهوڕەکاندا دەجەنگێن.

خوای گەورە هیچ کارێك قبوڵ ناکات تا بەتەواوی بۆ ڕەزامەندی ئەو و لەپێناوی خۆیدا نەبێت، لێرەوە ئەوەندە بەڵگە لەبەردەستدان کەلەم توێژینەوەیەدا لەژمارە نایەن، هەر ئەو بەڵگانە ئاماژە دەدەن کە ئەگەر بانگەواز یان تێکۆشان یان هەر کارێکی تر لەپێناوی غەیری خوادا بکرێتو بۆ ڕەزامەندی غەیری خوا بێت ئەوا هەر بەوەوە ناوەستێ کە ڕەتی بکاتەوەو بیداتەوە بەروویدا بەڵکو لەهەمان کاتدا خاوەنەکەی بەرەو لەناوچوون دەباتو لەسەر ڕوومەتی فڕێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخ.

هەردوو پێشەوا بوخاریو موسلیم لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: (پرسیار لەپێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کرا لەبارەی کە سێکەوە کەلەپێناوی ئەوەدا دەجەنگێ تاپێی بڵێن ئازایە، وەکەسێکی تریش کەلەپێناوی دەمارگیریدا دەجەنگێ، وەکەسێکی تریش کە لەپێناوی ڕوپاما یدا بجەنگێ، کەئایا کامیان لەپێناوی خوادایە، پێغەمبەری خوا فەرمووی" کە سێ کە لەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی خوادا بجەنگێ تەنها ئەوە لەپێناوی خوادایە")[10]

---

[10] صحيح البخاري – مع الفتح- (97/1) ، (22-21/6)، مسلم /1904

هەروەها لەچەندین فەرموودەی راستو دروستدا هاتوە کەلەرۆژی دوایدا کەسێك دەهێنرێتە لای خوای گەورە کەشەهید بوە..، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: (چیت ویست تیایدا ؟ ئەویش دەڵێ لەپێناوی تۆدا شەڕم کرد هەتا شەهید بووم، پەروەردگار دەفەرموێ: درۆت کرد بەڵکو ئەوەت ویستوە تاپێت بوترێت: فلان کەس کەسێکی دلێرو ئازایە دەی لەدنیادا ئەوەت پێوتراوە، ئینجا فەرمان دەدرێ تالەسەر روومەتی رابکێشرێو بخرێتە نێو دۆزەخ)

دیارە کە(بۆ کەسێکی زاناو قورئان خوێنو ماڵ بەخش) هەمان شتەو هەمان حوکم دەیانگرێتەوە[11].

یەکێك لەگرنگترین ئاسەوارەکانی پەروەردێتی بانگەواز کە لە پێناوی خوادا بێت ئەوەیە کە هەڵگرانی واتە بانگخوازان خواپەرستو کەسانی خوایی بن، خوای گەورە هەر بەو شێوەیە فەرمانی پێکردوەو دەفەرموێ: ﴿ **كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ** ﴾**آل عمران**79. واتە: خواپەرست بن هەربەوشێوەیە کەلە قورئاندا فێر بوونو ئەوەی کەتیایدا دەیخوێننەوە، ئەمەیش ئەوە دەخوازێت کەتەنها ملکەچو فەرمانبەرداری خوای گەورە بن، بەهیچ جۆر نابێت هیچ دەمارگیریەکی نەفامی تێکەڵ بەو نیەتە خواییە بکرێو لێ لای بکات، بەڵکو دەبێت لەسەر راستە رێ بەردەوام بنو لە سەری پایەدار بینو بەردەوام بەرەو پێش برۆنو نەگەرێنە دواوەو دوانەکەون، ئومێد بەخش بنو هیواگەشو بەرفراوانی سەراپای رۆحو جەستەی گرتبنەوە، موژدە بەخش بن بەسەرکەوتن، هیچ جۆرە تەمبەڵیو بێزاربونو چۆکدادان لای ئەو بانگخوازانە جێگای نابێتەوە، نائومێد نابنو چاویان لەپشتگیری خوای گەورەیە، چونکە ئەو

[11] السنن الكبري للبيهقي/ 552/13، المستدرك/1/1989.

بانگخوازانە دڵیان پەیوەستە بەپەروەردگاریانەوە کە بەردەوام بەهێزی لەبن نەهاتووی خۆی پشتگیریان لێ دەکات، چاویان لەو نورو بلێسە پڕ شنگدارە خواییەیە کە هەرگیز ناکوژێتەوە، ئەو نورە خواییە کە ئاسمانەکانو زەوی رووناك دەکاتەوە.

بانگەوازی ئیسلام بانگەوازێکی جیهانیە سەرپای گەلانو نەتەوەکان دەگرێتەوە، هەرچەندە ئەوگەلانە لەرووی نەژادو زمانو رەنگەوە جیاوازو جۆراو جۆر بن، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ**﴾**سبأ**28. واتە: ئێمە تۆمان بۆ ئەوە رەوا نە کردوە تاببیتە موژدەدەرو ئاگادارکەرەوەو ترسێنەر بۆ هەموو خەڵکی بەلاّم زۆر یێك لەخەڵکی ئەوە نازانن.

ئەم بانگەوازە گشتگیرەو هەموو لایەنو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، هەرلەمەسەلە باوەڕیەکانەوە تا مەسەلە فیکریو سیاسیو کۆمەلاّیەتیو هەتا ئابوریەکانیشو.. تادوایی، هەروەها چارەسەرو شیفا دەبەخشێ بە هەموو ئەوانە کە نەخۆشی دڵو دەروونیان هەیە، هاوکات رۆحەکان بەرزدەکاتەوەو ئاراستەی ئەقڵەکان دەکات بۆبەدەستهێنانی بەرژەوەندیە راستەقینەکانی دونیاو قیامەت، هەربەهەمان شێوە سەراپای کارە دونیاییو قیامەتیەکان دەگرێتەوە.

زۆر بەکورتی دەڵێین لەراستیدا بانگەواز ئەوەیە کەهەڵگری سەراپای ئیسلام بێت بەهەموو پایەو مەرجو حوکمو رەفتارو رەوشتەکانەوە، بەهەموو مەسەلەو باسو خواسەکانەوە، هەرهەموو ئەمانەی پێشەوە هەرلەخودی ئیسلامەوە سەرجەم سیفەتەکانی ئیسلام وەردەگرن بەخۆیو بە هەموو تایبەتمەندیەکانیەوە

لەپەروەردگارێتیو گ شتگیریو تەواوکاریو هاو سەنگیو تایبەتمەند یەکانی تریشەوە، لێرەیشدا بەم باسە دەوەستینو ناچینە نێو وردەکاریەکانەوە.

## پایەکانی بانگەواز

لە پێناسەکەوە ئەوە روون دەبێتەوە کە پایەکانی بانگەواز بریتین لە:

1- بانگخواز: ئەو کەسەیە کە بەبەرچاو روونی شەرع خەڵکی بانگ دە کات بۆلای خوای گەورە.

2- بانگکراو: ئەوکەسەیە کە بانگ دەکرێت بۆ ئیسلام.

3- بانگ بۆکراو: بریتیە لەئیسلام بە باوەڕو بە شەریعەتو بەهاکانو بەرەوشتەکەیو بەبەرنامەکەیەوە بۆ ژیان.

4- هۆیەکانی گوزارشت کردن لەبانگەواز: بریتین لەو هۆو شێوازانە کە بەهۆیانەوە ئیسلام دەگەیەنرێت لەگرنگترینیان گوتەی چاکە، هەروەها بەرنامەی بانگەواز یان بەرنامەی گەیاندن دەچێتە نێو ئەم پایەیەوە.

قورئانی پیرۆزیش چەندەها یاسای شەرعیو رێو شوێنی ژیرانەو بەحیکمەتو رێنمایی تێدایە کە پەیوەستن بەچوار پایەکەوە. لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین.

## پایەی یەکەم: بانگخواز

نیشانەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو لەروانگەی قورئانو سوننەتەوە:

**دەستپێك:**

ئێمە لێرەدا لەروانگەی قورئانو سوننەوە باس لەنیشانەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو دەکەین ئەوا هەردەبێ ئەوە بوترێ کە: یەکەمین بانگخوازو

پێشەنگی بانگخوازان پێغەمبەری خودایە(ﷺ) کە خوای گەورە بەبانگخواز بۆلای خوای گەورە ناوی بردوە.

دەفەرمویت: ﴿**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً ، وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُّنِيراً**﴾**الأحزاب**(45-46) پێغەمبەری خوا (ﷺ)قورئانێك بوە کە بەسەر زەویدا رۆیشتوە بەحیکمەتو رێنمایی‌و ئامۆژگاری چاك خەڵكی بۆلای خوای گەورە بانگ کردوە، بەباشترین‌و جوانترین شێواز مشتومڕی لەگەڵ بەرانبەرەکانیدا کردوە، خوای گەورەیش شایەتی بۆداوە کە کەسێکی خاوەن بەرەوشت بەرزە، بەڵکو لەبارەی رەوشت بەرزی پێغەمبەرەوە (ﷺ)سوێندی فەرموە کەدەفەرمویت: ﴿**وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ**﴾**القلم**4. واتە: ئەی پێغەمبەر بەراستی تۆ خاوەنی بەرزترین رەوشتی.

قورئانی پیرۆز بەرنامەی بانگەوازی ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ)روونکردۆتەوە کە گرتنەبەری رێگای راستە بەوپەڕی بەرچاو رونیەوەو بەحیکمەت‌و دانایی، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**﴾**يوسف**108. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ رێگاو رێبازی من هەر ئەوەیە کە بەبەرچاو روونی شەرع‌و شارەزاییەوە خەڵكی بانگ بکەم بۆلای خوای گەورە، خۆم‌و شوێنکەوتوانی من ئەوکارە دەکەین، پاك‌و بێگەردی‌و ستایش هەردەم شایانی خوای گەورەیە، هەرگیز من لەموشریکەکان نیم.

بەفەرمانی خوای گەورەش پێغەمبەر(ﷺ)بەردەوام بوو لە سەر گرتنەبەری بەرنامەی رێسای پلەبەندی‌و فیقهی کاکردن لە سەر لەپێش‌ترو گرنگترەکان، لەسورتی (المدثر)دا کە هاتوەتە خوارەوە لەگەڵ خۆیدا فەرمانی ئاگادار کردنەوەو

وریایی دانو بانگەوازی بۆلای خوای گەورەی هەڵگرتوە. خوای گەورەش دەفەرمویت: **يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ، قُمْ فَأَنذِرْ ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ، وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ، وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ المدثر( 1-7 )** . واتە:" ئەی ئەوکەسەی خۆت پێچاوەتەوە، هەستەو خەڵکی بێدر بکەرەوە، راستیەکان روون بکەرەوە، پەروەردگارت بەگەورەو مەزنو شکۆمەند ناوببە، پۆشاکت- دڵودەرونت، رەفتارت، لایەنی ماددیو مەعنەویت خاوێن بکەوە، هەمیشە دوورە پەرێزبە لەهەموو جۆرە تاوانێك، منەت مەکە بەسەر کەسداو هەموو هەوڵو چاکەو رەنجەکانت بەزۆر مەزانە، لەبەر خاتری پەروەردگارت هەمیشەو بەردەوام خۆراگرو ئارامگربە".

ئەم فەرمانە لەدوو توێیدا فەرمانی ئامادەباشیو خۆئامادەکردنی تەواوی تێدایە بۆ بانگهێشت کردنی قەومەکەیو ئامادەکردنیەتی لەدووتوێی هێزی باوەڕداو بەگەورە راگرتنی خوای تاكو تەنهاو وەدەرنانی هەر شتێکی تر لەدڵیداو یەکلایکردنەوەی بۆخوای گەورە، هەروەها خۆئامادەکردنی هزرییو جەستەیی بۆبەرگەگرتنو ئارامگرتن لەبەردەم ئێشو ئازاردا.

پێغەمبەر ﷺسەرەتا بەبانگەوازی نهێنی دەستیپێکردو ئەم قۆناغە سێ ساڵی خایاند، پاشتر هەرلەمەککەی پیرۆزدا بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد، دواتر بانگەوازەکەیی گواستەوە بۆ مەدینەی پیرۆز کە لەوێ لە دەسەلاتو فەرمانرەوایی پێغەمبەرﷺبوونە یاوەری بانگەوازەکە، دواتریش بانگەوازو دەسەلاتو فەرمانڕەوای لەسەردەمی جێنشینە راشیدەکاندا بەتەنیشت یەکەوە بەردەوام لەبەرەوپێش چووندا بوون، بەلاّم ئەوە هەر بانگەواز نەبوو، تەنانەت تێکۆشان(الجهاد) بەمانا گشتگیرەکەی یەکێ لەهەرە گەورەترین ئاما نجەکانی

بلاۆكردنەوەی بانگەوازی راستو دروست بوو بۆلای خوای گەورە، ئەویش لەرێگای سەركەوتنو زاڵبون بەسەر ئەو ملهوڕانەدا كە رێگریان لەبانگەواز كردوەو بوونەتە بەربەست لەنێوان بانگەوازو خەڵكیدا[1].

## گرنگترین مەشخەڵەكانی بانگەواز لەسەردەمی مەككەدا :

1- ئەو پەڕی گرنگیدان بەبناغەو دامەزراندن، بەدروستكردن، بەجەخت كردنو چڕكردنەوە، لەسەر باوەڕی چاكو بێگەردو وەلانانی بێ باوەڕی بە هەموو شێوەكانیەوە، وە هێنانی خەڵكی بۆناو ئاینی تازە لە سەر بناغەی یەكتاپەرستی پاكو بێگەرد.

2- هەوڵدان بۆبەهێزكردنی باوەڕی باوەڕدارە نوێیەكان، پەروەردەكردنیان لەسەر بەها بەرزو بالاكان، لە سەر ئارامگرتنو دامەزراوەیی، هاوكاتیش فێركردنیان بەئاینی نوێو ئەو یاسا شەرعیانەی كە یەك لەدوای یەك دەهاتنە خوارەوە.

3- رووبەڕووبونەوە لەگەڵ بڕوبیانووی بێباوەڕانداو پوچەڵكردنەوەیان بەبەڵگەی سەلمێنەرو لەبەرچاو ئەمیش لەدووتوێی شێوازێكی لەسەرخۆو نەرمو نیانو ئامانجداری كاریگەردا.

4- رەچاوكردنی فیقهی مەسەلە لەپێشترو گرنگترەكان (الاولويات) كە هەوڵەكان چڕكرابونەوە لەسەر بیرو باوەڕی راستو دروست بەتایبەتی یەكتاپەرستی پاكو بێگەرد، بەرەنگاربونەوە لەگەڵ بێباوەڕیدا بە هەموو

[1] سيرة ابن هشام(1/240-246)، زاد المعاد(2/48)،السيرة الصحيحة).د.اكرالعمرى /ل/75

جۆرو شێوازەکانیەوە، جەخت کردن لە سەر بەها رەو شتیەکان، لە سەر پاککردنەوەی دەروونو پەروەردەیەکی گشتگیر.

5- رەچاوکردنی رێسای پلەبەندیو قۆناغ بەندی لەهەموو لایەنەکانیدا لەرووی دابەزینی حوکمە شەرعیەکانەوە کە لەقۆناغی مەککەدا بەپلەبەندی هاتونەتە خوارەوە، لەسەر قۆناغی نهێنی بانگەوازو پاشتریش لە سەر قۆناغی ئاشکرا، لەسەر هەنگاوەکانی بانگەواز، وەلەسەر رووبەروو بونەوەی بێباوەڕان لەسەرەتاوە بەروونکردنەوەو ئارامگرتنو بە بەڵگە قورئانیەکان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَاداً كَبِيراً**﴾**الفرقان**52. واتە: بەقورئان رووبەروویان ببنەوە بەجۆرێکی وەها کە هیچ بڕوبیانویەکیان نەمێنیو بۆڕ بدرێنو لەسەر خەباتو تێکۆشانی خۆت بەردەوام بە.

6- پاراستنو پارێزگاری کردن لەمسوڵمانە نوێیەکان، ئەویش لەرێگای رێگری کردن لێیان لەرووبەروبونەوەو بەکارهێنانی هێزەوە، لەروو بەروو بونەوە بەهێز دژ بەبێ باوەڕان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ**﴾**النساء**77 واتە: وازبهێننو دەست بپارێزنو مەجەنگێن، ئاینی خوا ناشیرین مەکەن، لەئەمڕۆدا هەوڵ بدەن نوێژی چاكو دروست بکەن.

7- هەوڵدانی بەردەوام بۆ فراوانکردنی بازنەی بانگەواز، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾هەر بەبانگەواز کردنی خەڵکی مەککە دەست کۆتا نەبوو، بەڵکو ئەوەبوو کەچوو بۆ تائیفو دەوروبەری، بانگەوازەکەی خستە پێش چاوی هۆزەکانو گەیاندنی بەوشاندە عەرەبیانە کە لەدەرەوەی مەککەوە بەهەرهۆیەکەوە دەهاتنە مەککە.

8- گرنگیدان بەپلاندانان بۆ ئایندەی بانگەوازو دیراسەکردنی بارودۆخی ئەو شوێنانە کە گونجاون کۆچیان بۆ بکرێت، ئەوەبوو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەندێ لەهاوەڵانی خۆی نارد بۆ حەبەشە، گرنگی تایبەتی شیدا بەدانیشتوانی مەدینە کەبانگەوازەکەی دەخستە بەردەم ئەو خەڵکەی کە لەمەدینەوە دەهاتن بۆ مەککە تاسەرەنجام پەیمانی عەقەبەی یەکەم هاتە دی، ئینجا دووەمیش بەدوایدا هات، پاشتر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەندێ لەهاوەڵەکانی بەسەرۆکایەتی موسعەبی کوڕی عومەیر نارد بۆ مەدینە تائاینی ئیسلام بلاوبکەنەوە - خوای گەورە لەهەموویان رازی بێت-.

## مەشخەڵەکانی بانگەواز لەشاری مەدینە

1- بەردەوام بون و درێژە پێدانی بانگەواز بەمانا گشتیەکەی لەناو شاری مەدینەو لەدەرەوەیدا بەبەکارهێنانی هەموو هۆکارە بۆ رەخساوەکان، وەبەدواداچونی پەروەردەو پاککردنەوەی دەروون بۆ ئەوانەی کە هاتوون بەدەم وەرگرتنی ئیسلامەوە، ئەویش لەرێگای خوێندنی قورئانی پیرۆزو لەبەرکردنی هاوکات فێرکردنیان بەئەزموونی ژیان.

2- بەهێزکردنی پێشەنگی بون و بانگەوازی زانستیانە لەرێگای دروستکردنی پەیوەندی برایەتی لەنێوان کۆچبەران و پشتیوانانا.

3- دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی کەشەرعی خوا بەرجەستە بکرێت تیایدا، هاوکات بەرژەوەندی وڵات و بەندەکان دەستەبەر بکات، هەروەها دەستی بەبلاوکردنەوەی بانگەواز لەسەر بناغەی دادپەروەری و شوراو یەکسانی و بەزەیی بۆ هەموو جیهانیان، وێڕای ئامادەکردنی هەموو جۆرە هێزێك بۆ

تۆقاندنی دوژمنان تانەیەت بەخەیاڵیا ـدا هـ ـێرش بهێنـ ـنە سەردەوڵەتی ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَ ـمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَـ ـمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ** ﴾**الأنفال**60 واتە: "ئەوەی لەتواناتاندایە لەهێز ئامادەبکەنو ئامادەباشی بکەن بۆیانو بەهێز رووبەرویان ببنەوە.....".

4- بانگەواز کردن بۆ ئاشتەوایىو پەیمان بەستن ـبۆ جێ ـبەجێکردنی ئا شتیو جێگیر بوونی ئارامی لەووڵاتدا، خوای گەورە دە ـفەرموێت: ﴿**وَإِن جَنَـ ـحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ** ﴾**الأنفال**61 واتە: ئەگەر بەرانبەرەکانتان ﴿ لەبێباوەڕو ناحەزانو کەسانی خاوەن ـپەڕاوەکانو دوژمنان- لایەنی ئاشتیان هەڵبژاردو بایاندا ـیەوە ـبەلای ئا شتیدا ـئەوا تۆیش- ئەی پێغەمبەر- ئاشتەوایی بکەو پشت بەخوای گەورە ببەستە کە هەرخۆی بیسەرو زانایە بەشتەکان.

5- بانگهێشت کردنی پادشایانی جیهان بۆ هاتنە نێو ئیسلام، وەئە ـگەرنا ـبا بەلایەنی کەمەوە بێنە نێو بازنەی ئاشتی، کە نامەی بۆ هەمویان نوسیوەو تیایدا بانگهێشتی کردوون بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، یان بێنە نێو ئاشتیو ئاشتەوایی. بەم شێوەیە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾جیهانبوونی ئیسلامی دوو ـپات کردەوە، کەتوانای لەخۆ گرتنی هەمووانی نیە.

6- دەرکەوتنو هاتنە رووی جۆرێکی نوێ لەبانگەواز کە ـخۆی لەباذ ـگەوازی کردنی دووڕوەکاندا دەبینێتەوە، کە لەرواڵە ـتدا خۆ ـیان وە ـکو مـ ـسوڵمان دەخستە روو بەلاَم لەهەناویاندا بێ باوەڕ بوون، ئەم توێژە کۆمەڵێك کێشەی

گەورەیان هەبوو، بەراستی ئەوانە تابووری پێنجەم بوون کەدەیەوێت گومان دروست بکاتو توا ـناو وزەی ئو ـمەتی ئیـ ـسلام ـپەك ـبخات، هاو ـكات سەرقاڵکردنیان بەکۆمەڵێ شتی ترسناکەوە بۆ ئەوە سەریان نەپڕژێتە ـسەر کێشە سەرەکیەکانو مەسەلە زیندووەکانی دەوڵەتی ئیسلامەوە  ـهەروەك لەرووداوی بوختان- افك- دا روویدا.

لێرەوە مامەڵەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەگەڵیاندا مامەڵە ـیەکی حەکیما ـنەو ئارامگرانە بوو، بەرگەی گرت لەبەردەم ئەو ئازاردانو نابەجێیا ـنەیان ـکە بەرامبەر بەپێغەمبەرو مسوڵمانان کرد ـیانو ـخوێنی نەڕ ـشتن، ـئەوەیش رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەرزگار بوون لەو کێشەیەو مسوڵمانان بە ـکەمترین خەرج رزگاریان بوو، کەلەهەمان کاتدا بووە هۆی یەکڕیزیو توندوتۆڵ بوونی مسوڵمانانو زیادبوونی هێزیان.

## نیشانەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو

لەو کورتە باسەی لەپێشەوە خستمانە روو، لەدوو تویێی ئایەتە پیرۆزەکانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەنیشانەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو بریتین لەمانەی خوارەوە:

1- **دەبیٚ خاوەنی باوەڕێکی بەهێز بێت:** دڵسۆزانە بۆخواو لەبەرخوا بژی، جگە لەدەستخستنی رەزامەندی خوای گەورە لەبانگەوازەکەیدا مەبەستی هیچ شتێکی تر نەبێت، کەسێکی لەخوا ترسو ملکەچ بێت، تەنها لەخوای گەورە بترسیٚ، خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿**الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيباً**﴾**الأحزاب**39 واتە: ئەو کەسانەی باوەڕدارانە پەیامی خوا دەگەیەننو لێی دەترسنو جگە لەخوا لەهیچ کەسێکی تر ناترسنو دەڵێن ئێمە تەنها خوامان بەسە، ئەو تاكو پشتو پەنامانە.

بەکورتی: دەبیٚ بانگخواز باوەڕێکی قوڵو زانستێکی وردو دروستو رەوشتێکی بەرزو مەزنو رەفتارێکی راستو دروستی هەبێ، بەجۆرێکی وەها کە لەگوفتارو کردارو رەفتارەکانیدا ببێتە پێشەنگو نمونەیەکی باش، تائەم فەرموودەی خوای گەورەی بەسەردا نەچەسپیٚ کەدەفەرمووێت: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ، كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ**﴾**الصف**2 واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێنو بڕیاری لەسەر دەدەن بەڵاٚم ئەنجامی نادەن، ئەی نازانن ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خوای گەورە زۆر رقی هەستیٚو خەشمو قینی بجوڵیٚو تۆڵەتان لیٚ بسەنیٚ ئەوەش کاتێك کە شتێکی

چاك دەڵێن‌و بڕیاری چاك رادەگەیەنن بەلاّم ئەنجامی نادەن، یاخود لەجیاتی ئەوەدا شتێكی خراپ ئەنجام دەدەن.

دەبێ بانگخواز پێغەمبەری خوا(ﷺ)بکاتە پێشەنگی خۆی کە وەك قورئانێك بووە بە سەر زەو یدا رۆی شتوە، رەو شتی جوان‌و بەرزی، پێغەمبەر(ﷺ)بیگرێتەوە، خۆی بڕازێنێتەوە بەو گەو هەرەی ئەوەوە، لەو باسەی قورئانی پیرۆز تێ بگات کە بانگخواز بەوە وەسف دەکات کەدامەزراو و پایەدار بێت لەسەر رێگاو رێبازی راست بەردەوام بێت لەسەری تادەگاتە ئامانجە خوازراوەکان، جگە لەخوا لەکەسی تر نەتر سێت، لەگازە ندەو سەرزەنە شتی سەرزەنشتکاران نەترسێ، هەرچی لەو رێگا یەدا توش هات خەم‌و پەژارە نەیگرێت، سەربەرز بێت‌و بنازێ بە ئی سلامەکەیەوە، لەکاتی هەڵ سوکەوت کردندا لەگەڵ خەڵکیدا رەوشتێكی ئارام‌و لەسەر خۆی هەبێت، تەنانەت دەبێت بەچاکە بەرپەرچی هەر خراپەیەك بداتەوە کەلەبەرانبەر یەوە دەکر یت، ئە گەر هاتوو شەیتان بەرۆکی گرت‌و ویستی لە هەڵوێستێکدا بیخاتە سەر وەسوە سەو هەڵسوکەوتی نابەجێی خۆی، ئەوا با ناوی خوای گەورە ب بات‌و وەسوە سەکەی بسڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ ا سْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْ شِرُوا بِالْجَ نَّةِ الَّ تِي كُ نتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَ شْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ، نُزُلاً مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ، وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَ عَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ، وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ، وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾فصلت**( 30-36 ) واتە: (ئەوانەی لەدنیادا

بەدڵو بەکوڵ وتویانە پەروەردگاری ئێمە (الله)یە، پاشان بەرێكو پێكی پابەندی ئاینو بەرنامەی ئەو زاتە بوون، ئەوانە لەسەرە مەرگدا پۆل پۆلو دەستە دەستە فریشتە دادەبەزنە لایانو سێ موژدەیان دەدەنێ:

یەکەم: مەترسن لەرۆح کێشان، لەسزای گۆڕ، لەرۆژی قیامەت، لەدۆزەخ.

دووەم: خەفەت مەخۆن، بۆ بانگەوازو بۆ ئەوکەسانەی کەخەمخۆریان بوون، بۆ ماڵو خێزانتان، بۆ ئیشو کارتان.

سێیەم: موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کەبەڵێنتان پێ درابوو کە چاوەڕێتانەو بەم زووانە دەچنە ناوی، دڵنیابن کە ئێمە پشتو پەناو یارو یاوەری ئێوەین لەژیانی دنیادا..... لەقیامەتیشدا پێ شوازیتان لێ دە کەین لەوبەهە شتەدا کەخوای گەورە بۆی ئامادە کردوون، هەموو ئەوانەش لەلایەن زاتێکەوەیە کە تەواو لێ خۆش بوەو تەواو میهرەبانە، جاکێ هەیە قسەو گوف تاری لەوکە سە چاکترو جوانتر بێت کە خەڵکی بانگ دەکات بۆ لای ئاینی خوا، بۆ پابە ندیو بۆچاکەو چاکەکاریو هاوتەریبیش کاروکردەوەی جوانو چاك ئەنجام دەدات پاشانیش ئیعلانی ئەوە دەکات کە دەڵێت من مسوڵمانم، بێ گو مان ئیما ندار لەوهەوڵەیدا کۆسپو لەمپەر دێتە ڕێی بۆیە دە فەرموێت: بێگو مان چاکەو خراپە چون یەك نین، تۆ هەوڵبدە بەجوانترینو چاکترین شێوە دەست بەخرا پەوە بنێیت، ئەوکاتە دەبینی ئەوکەسەی دوژمنایەتی هەیە لەگەڵ تداو حەزت پێ ناکات دەبێتە دۆ ستی گ یانی بەگیانیو خۆشەوی ست، جا ئەو هەڵوێ ستە مەردانەیە کەس ناتوانێت ئەنجامی بدات جگە لەوانەی کە خۆگرو ئارامگرنو ئەوانەی کەزۆر بەختەوەرن، بێگومان شەیتان دوژمنەو حەزناکات ئیماندار پلەی بەرز بەدەست بهێنێـت بۆیە خوای گەورە ڕێنما یان دە کاتو دە فەرموێت:

هەرکاتێك شەیتان ویستی تووشی هەڵت بکات یان دوورت بخاتەوە لەو بوارە چاکەیە تۆ پەنا بگرە بەخوای پەروەردگارت، چونکە ئەو زاتە تەواو بیسەرە بەهەموو گوفتارەکان، تەواویش زانایە بەهەموو نیەتەکان).

2- **دەبێ بانگخواز کەسێکی زاناو بەرچاو روون بێت:** بەجۆرێ کەپشت ببەستێت بەحوکمی خواییو بەبەرچاو روونی هەنگاو هەڵبگرێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**﴾**يوسف** واتە: (ئەی پێغەمبەر بڵێ رێگاو رێبازی من هەر ئەمەیە کە خەڵکی بانگ دەکەم بۆلای خوای گەورە، ئەوکارە بەبەرچاو روونی دەکەم، ئەوانەیش شوێنکەوتەی منن هەروا دەکەن، پاکیو بێگەردی بۆ خوای گەورەو من بەریم لەکۆمەڵی بێ باوەڕانو لەوان نیم). ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە گرنگترین نیشانەکانی بانگخواز دیاری دەکات کە دەبێت بەر چاو روون بێت بەو بانگەوازەی کە دەیکات(بصیرة) واتە: تێڕوانینی قوڵ بۆ ئایندەو دوور بینو سەیری ئایندەی دوور بکات کە چی دەبێت، هەروەها دەبێت بیرکردنەوەیەکی راستو دروستی بۆ سەرەنجامی کارەکانو ئاسەواریان هەبێ، لەراستیدا(بصیرة) لەناوەڕۆكو لە حەقیقەتی خۆیدا ئەوەیە کە لەم سەردەمانەدا پێی دەوترێت: بیرکردنەوەی ستراتیجی، پلانی ستراتیژی، ئەمەیش ئەوە دەخوازێ بانگخواز پڕ چەك بێت بەزانستو بەزانیاریەکان، شارەزا بێت بەئەزموونەکان، هۆشیار بێت بەواقیعی ئوممەتەکەیو بەدوژمنانیشی، ئینجا لەم روانگەیەوە دواجار بێت پلانی ستراتیژی سەرکەوتوو دابڕێژێ.

3- **دەبێ بەوپەڕی گەرمو گوڕیەوە لەکاردا بێتو ئامادە بێت بۆ قوربانیدان،** هەروەك خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرانی( کەبانگخوازن) کردوە کەتا

بەپرنسیپی هێزەوە بجولێینەوەو توندوتۆڵو لێبڕاوبن، خوای گەورە دەفەرموێت: **يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً** مريم12. واتە: (ئەی یەحیا ئەو پەیامەی کەبۆت هاتوە بەوپەڕی گەرمو گوڕیو لێبڕانو بەهێزی وەریبگرە) دەفەرموێت: **فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا** الأعراف145 واتە: (ئەی موسا بەتوندوتۆڵی پەیڕەوی بکەو رایبگەیەنەو فەرمان بدە بە قەومەکە شت کە با پەیڕەوی چاکترینی بکەن).

هەر لەم پێگەیەوە فەرمان بەئارام گرتن دراوە ئەویش لەپاش فەرمانی هەستان بەکاری بانگخوازی، خوای گەورە دە فەرموێت: **وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ** العصر3 واتە:( فەرمانو رێنمایی بدەن بەراستی واتە بەئاینو فەرمانیش بدەن بەئارامگرتن). خوای گەورەیش لە چیرۆکی لوقمانی حەکیمدا لەسەر زمانی لوقمانەوە دەفەرموێ: **يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ** ...لقمان17. واتە: (ئەی کوڕی شیرینم نوێژ بکەو فەرمان بکە بەچاکەو رێگری بکە لەخراپەو ئارامگربە لەسەر هەر بەڵاو زەحمەتو ناڕەحەتیەك کەتوشت دەبێت).

پێغەمبەری خوایش ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ بەوپەڕی هێزو ئارامگرتنو خۆڕاگریەوە ئەم بانگەوازەی هەڵگرتوە، هەروەك بەسەنەدێکی راست لەعەقیل کوڕی ئەبوتالیبەوە ریوایەت کراوە کەوتویەتی: (قورەیشەکان هاتنە لای ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ وتیان: ئەوەی راستی بێت ئەم برازایەی تۆ لەیانە کۆمەڵایەتیو لەبازاڕو لەمزگەوتماندا شوێنی سەرپەرشتیماندا زۆر ئازارمان دەدات - واتە شوێنی پەرستگای ئەوکاتەی ئەوان کەدیارە مەبەستیان کەعبە بووە- رێگری لێ بکەو مەهێڵە ئازارمان بدات، ئەبوتالیب وتویەتی: ئەی عەقیل بچۆ موحەمەدم بۆ بهێنە، عەقیل دەڵێ منیش چووم بۆلای، ئەبو تالیب وتی: ئەی برازا کەم: نەوەو

کوڕە ئامۆزاکان- واتە قەومەکەت  دەڵێن  کەتۆ لەیا نەو  کوڕو مز گەوتیان ئازاریان پێدەگەیەنێت، دەی دەست کۆتابەو واز بهێنە، عەقیل دەڵێ: پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾سەری بەرز کردەوەو چاوی بڕییە ئاسمان، ئینجا فەرمووی:" ئا یا ئەو خۆرە دەبینن؟" وتیان بەڵێ، ئینجا فەرمووی: (من توانام ناشکێ بەسەر ئەوەدا کە بلێم ئەو خۆرە بۆ ئێوە بێت تائێوەش بێن لێیەوە رۆشناییەك دابگیرسێنن بۆم) عەقیل دەڵێ: ئەبو تالیب وتی: برازاکەم بەدرۆی نەخستینەوە، دەی بگەڕێنەوە)[1].

دواتر ئازاردانی قوڕەیش لەسەر پێغەمبەرو﴿صلى الله عليه وسلم﴾لەسەر هاوەڵانی دە ستیپێکردو بەردەوام کەوتنە ئازاردانیان بەڵام ئەوان ئارامیان گرت.

**4- دەبێ بانگخواز فرە پرسو رابێو راوێژ بەبراکانی ب کاتو رێز حاییو ئامۆژگاریان وەربگرێت:** خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی داوە کە بەوجۆرە مامەڵە بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ** .....﴾ **آل عمران**159 واتە: (لەهەڵەیان خۆش ببەو داوای لێ خۆش بونیان لەخوای گەورە بۆ بکەو لەکاروبارەکاندا راوێژیان پێ بکە) خوای گەورە لەوەسفی باوەڕداراندا دەفەرموێ:﴿....**وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ** ...﴾ **الشورى**38 واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی باوەڕدارانو مسوڵمانان ئەوە یە کە کاروبارەکانیان بەراوێژ بەیەکتر کردن رادەپەڕێنن) پێغەمبەری خوایش ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ئاینی چڕکردۆتەوە لەوشەی دڵسۆزیدا ئەوەیش لەبەر گرنگیەکەی، دەفەرموێ: (ئایین دڵسۆزییە) وتمان: بۆ کێ؟ فەرمووی: (بۆ خوای گەورە، بۆ پەڕاوە پیرۆزەکەی، بۆ پێغەمبەرەکەی، بۆ پێشەوای مسوڵمانانو بۆ گشت مسوڵمانانی تریش)[2]

---

[1] رواه يعلي في مسنده، والطبراني في الاوسط والكبير
[2] رواه مسلم/ **ژمارە**(55)

5- **دەبێ بانگخواز مامەڵەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا جوانو سەرکەوتوو بێتو ئەزمونی هەبێت:** بەجۆرێ کە خەڵکی خۆشیان بوێتو لەهەمان کاتیشدا ئەویش ئەوانی خۆش بوێت و دوعای خێریان بۆ بکاتو داوای لێ خۆش بونیان بۆ بکات، گومانی باشیان پێ ببات، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی فەرمووە: ﴿**فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ** .... ﴾**آل عمران**159.

واتە: " ئەی موحەمەد پەروەردگاری میهرەبان رەحمەتو میهری تایبەتی خۆی لەنێو دڵو دەروونی تۆدا چاندووە، بۆیە ئەوەندە بەرەحمو نەرمو نیانیت، خۆئەگەر تورەو قسە رەقو بێ بەزەیی بویتایە، ئەوا کەس لەدەورت نەدەماو هەموو بلاوەیان لێدەکرد، کەواتە بەردەوام چاوپۆشیان لێ بکەو لێیان ببورەو داوای لێخۆش بونیان بۆبکە، لەکاتو پێشهاتو شتی گرنگدا پرسو رایان پێ بکە"

ئەم سیفەتانەی کەلەدووتوێی ئایەتەکەدان کە دەبنە هۆی ئەوە کە خەڵکی بانگخوازیان خۆش بوێت.

6- **دەبێ بانگخواز ئەوپەڕی هەوڵو ڕەنجی خۆی بخاتە گەڕ بۆ خۆئامادەکردنو ئامادەباشی تەواوی هەبێ بۆ بانگەواز کردن بۆلای خوای گەورە**، لەرووی فێربونو لەبەرکردنو مەشقو راهێنانو سوود وەرگرتن لە ئەزمونی بانگخوازانی ترو ئەزمونی ژیانەوە سازو ئامادە بێت، هەروەها پێویستە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی هاوکاری ئەو بانگخوازانە بکات تابتوانن ئامادە باش بن بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە قورسە، ئەویش لەرێگای پەروەردەکردنو زانکۆکانو کۆمەڵە ئیسلامیەکانەوە.

## ئامادەكردنی بانگخواز لەقورئانی پیرۆزدا

یەكێ لەهەر گرنگترین هۆكارەكانی سەركەوتنی بانگخواز بۆلای خوای گەورە بریتیە لەئامادەكردنێكی زۆر باشی بانگخواز، بەگەشەدان بۆخودی خۆیو توانا خوا پێیدراو و خۆڕ سكەكان تیا یدا، وە لەرووی سیفەتو رەو شتو بەها بالاكانیەوە، هەروەها مەشق پێكردنو فێركردنی، هاوكات بە سوود وەر گرتن لەئەزمو نە رابردوە كانی... جا لەپێناو ئەو ئامادەكرد نەدا هەر سێ سورەتی(أقرأ، المزمل، الدثر) لەقورئانی پیرۆزدا بۆ دە ستەبەركردنی ئەو پەروەردەیە هاتونەتە خوارەوە، كە هەریەك لەو سورەتانەش ئەو رۆڵەی بینێ یوە كەلێی داوا كراوە.

سورەتی(أ قرأ) گرنـ گی دەدات بەئامادەكردنی زانـ ستیو پەروەردەیی، كەبەرنامەیەكی بۆ پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾و لەرێگای ئەویشەوە بۆ بانگخوازان داناوە كەتا خوێندنەوەیەكی تەواو و گشتگیر بۆ قورئانو بۆ بونەوەرو بۆ مرۆڤ بـ كەن، ئەو خوێندنەوە یەش ببە ستنەوە بە پەروەردگارەوە كە یە كەمین پەروەرشكارە، هاوكات هۆشداری دان بەسەرەنجامی خراپی ملهوڕیو خۆ بێ نیاز كردن، پاشان باسكردنی هەندێ لەحاڵەتەكانی ملهوڕان، دواجاریش جەخت دەكات لەسەر گوێڕایەڵی كردنی خوای گەورەو سوژدە بردنو نز یك كەوتـ نەوە لەخوای گەورە، ئەمەیش بۆ ئەوەیە تا ئەو ئازارو نارەحەتیانەی كە لەدوژمنانی خواوە تووشی بانگخواز دەبن لەسەری سووك بن.

بەلاّم لەسورەتی (المزمل) رێنمایـ یەكانی چڕكردۆتەوە لە سەر ئا مادەكردنی ئیمانیو توێشوو زەخیرەی رۆحی، ئەویش لەرێگای شەونوێژكردن بەهە ستانی

نیوەی شەو یان کەمتر لەنیوەی، وەبەخوێندنی قورئانو وەردبو ـنەوەو تێف ڪران لێی لەشەودا، هەروەها زیکرو تەسبیحات کردنی زۆر، پاشانیش فەرمان ـکردن بەئارام گرتن، دوا ـتریش ـخۆ ئا ـمادەکردن ـبۆ رووبەرووبو ـنەوەی مە ـلهوڕیو ستەمکاری قوڕەیش، ئالێرەشدا خوای گەورە بەکورتی باسی چیرۆکی فیرعەونو لەناوچونی دەکات لەگەڵ بەستنەوەی بەبارودۆخی قورەیشەوە، کەتیایدا ـخوای گەورە پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾دڵنیا دەکا ـتەوەو ـئارامی ـپێ دەبەخ ـشێ ـکە سەرەنجامو پاشەرۆژ هەر بۆ لەخوا ترسانو پارێزگارانە، لەکۆتایی سورەتەکەشدا خوای گەورە باس لەگرنگێتی جێ ـبەجێکردنی زۆر زووی فەرما ـنەکانی ـخوای گەورە دەکات، ئەوەبوو کە لەسەرەتاوە سورەتەکە بەشەو هەستانو بە ـشەونوێژ دەستی پێکردو بەوەیش کۆتایی پێ دەهێنێت کە خوای گەورە ـخۆی ـشایەتی دەدات کە پێغەمبەرەکەیو ئەوانەیش کەلەگەڵیدان هەستاون بەجێ ـبەجێکردنی ئەو فەرمانەی خوای گەورە.

دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَى وَآخَرُونَ يَـ ضْرِبُونَ ـفِي ا ـلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَاقْرَؤُوا ـمَا تَيَـ سَّرَ مِـ نْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْراً وَأَعْظَمَ أَ جْراً وَا سْتَغْفِرُوا الـ لَّهَ إِنَّ الـ لَّهَ غَـ فُورٌ رَّحِيمٌ﴾المزمل**20 واتە:" ئەی موحەممەد بەرا ـستی ـئەو ـپەروەردگارەت ـچاك دەزانێت کە تۆ نزیکەی دوو بەشی شەو یاخود نیوەی یان سێیەکی هەڵدەستیو شەونوێژ دەکەیت، هەورەها هە ـندێك ـلەو ئیماندارا ـنەی ـکەهاوەڵتن ـهەمان پەرستش ئەنجام دەدەن...."

دواجاریش پەروەردگار بەرنامەی ئاسانکاریان بۆ روون دەکاتەوە، بەرەچاو کردنی بارودۆخی ئەوکەسانە کە بیانوو پاساوی شەرعیان هە یە، وە روونکرد نەوەی بارودۆخی خەڵکەکەو جۆرەکانیان لەتێکۆشەرانو بازرگا نانو هاو شێوەکانیان، پاشان بەکۆمەڵێ فەرمان کۆتایی بەسورەتەکە هێناوە کەهەرهەمویان لەپێناو جێ بەجێکردنی ئامادەبا شی ئیمان یە لەپێناو هەڵگرتنی بان گەوازو بلاوکردنەوەیدا.

سورەتی(**المدثر**)یش بەچڕی باس لەپێداوی ستیەکانی بان گەوازو توێ شوەکەی دەکات، باس لەنیشانەکانی بانگخواز دەکات کە دە بێ باوەڕێکی را ستەو دروستو بەهێزی هەبێت، ئەم سورەتە پاكو دڵو دەروونو پاکی جەستەو دیمەنو رووخسارو رواڵەتی جوان دەبەستێت بەیەکەوە **وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ** **المدثر**4 ، پاشان با سی کۆ مەڵێ رەو شتی جوانو کاری گەری کردوە لەوا نە رووخۆ شیو خۆبەکەمزانین، منەت نەکردن بەسەر هیچ کەسێکدا بائەو بانگەوازەش شتێکی زۆری پێشکەش بەوکە سە کردب ێت، وەخۆڕازاند نەوە بەئارامگرت نەوە کە لەدڵێکەوە هەڵگۆزراوە پەیوەستە بەخوای گەورەوە.

دواتر سورەتەکە باسی یەکێ لەکەسە ملهورە بێ باوەڕە سەرکێشەکانی قوڕەیش دەکات، پاشان دێتە سەر باسی ئاگری دۆزەخو سیفەتەکانی، ئا ماژە دەدات بەجۆرەکانی خەڵکی لەخاوەن پەراوە ئاسمانیەکانو کەسانی تریش، هەروەها باس لەپەیوەندی نێوان دەروونی مرۆڤو ئەو کردەوانەیدا دەکات کە پێیان هەڵدەستێ، هەموو مرۆڤێك بەرپرسی ئەوکارەیەتی کە دەیکات دی لەو کردەوە کەی خۆی کۆتو بەندی دەکاتو بەرپرسە لێی، پا شتر با سی د یمەنێکی گەورەو زۆر

ترسناك دەكات كە لەدۆزەخدا روو دەدات ئەويش وتويژيكە لەنيوان خەلكى بەهەشت (كەلەبەهەشتدان) وەلەنيوان تاوانباران (كەلەدۆزەخدان).

سورەتەكە پاشتريش بەرنامەيەكى گەورەو مەزن ديارى دەكات، ئەويش ئەوە يە كە دەبێ بانگخواز كاروفەرمانى خۆى بداتە دەستى پەروەردگارو خۆى رادەستى خوا بكات، چونكە سەرەنجامى هەموو كاروفەرمانەكان هەر لاى پەروەردگارن، بانگخواز هەر ئەوەى لەسەرە هەستێ بەجێبەجێكردنى ئەركى بانگەوازو زۆر جەختى لەسەر بكاتەوە، بەلاّم ئەوە بزانێ كە ئەنجامەكە لەدەستى خواى گەورەدا يە: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ﴾المدثر56. واتە: (جائەو خەلكە پەند وەرناگرێتو بير لەو راستيانە ناكاتەوە بەدەر لەويستو ئيرادەى خواى گەورە كەلەگەلّ ويستى ئادەميزادە ژيرە بەختەوەرەكاندا يەكانگير دەبێت، هەرئەو زاتە خۆى شايستەى ئەوەيە سەرجەم خەلكى لەخەشمو قينى بترسن، بەتايبەت كەئەو زاتە لەخۆى گرتوە لێخۆش بوو بێت لەئيماندارانى گوناهبار كاتێ كە تەوبە دەكەنو داواى لێبوردنى لێدەكەن).

ئاليرەوە دەبێ بانگخواز سوود لەهەموو زانستەكانو بەرنامە پەروەردەييەكان وەربگرێت، هەموو ئەو هۆكارە سەركەوتوانە كەدەبنە هۆى كاركردنە سەر بەرانبەرو كاريگەرى دەبێ لەسەرى بەكاربهێنى ئيتر ئەو هۆكارانە كۆن يان نوێ بن، ئەوە خۆى سەرپشكە، هاوكات دەبێت خۆى برازێنێـەوە بەهەر توێشويەكى رۆحى يان زانستى كەپێويستى پێى دەبێ ، دەبێ خۆى بۆ خۆى بەرنامەو پلانى قۆناغبەندىو ستراتيژى هەبێت لەكاركردنو جێبەجێكردندا، تابتوانێ بەشێوەيەكى خوازراو كاريگەرى لەسەر كۆمەلگا هەبێت، هەر لێرەشدا دەبێت ئاماژە قورئانى پيرۆز بدەين كە رێسايەكى گشتگيرو گەورەى داناوە ئەويش

ئەوەیە کەبونەوەر هەرهەمووی لەجوڵەدایە، وە هەوادارانی نارەواو نا هەقی لەجوڵەدانو دەجوڵێن، لەسەر بانگخوازیش پێویستە کەدەبێ بجوڵێنو پێش بکەون، چونکە ئەگەر پێش نەکەون ئەوا دوادەکەونو سەرەنجام دەوەستێنو چەق دەبە ستن، خوای گەورە دە فەرموێت: ﴿لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾المدثر37واتە: "هەرکەس لەئێوە بیەوێت ئەوا با هەوڵی پێ شکەوتن بداتو پێش بـ کەوێت یان ئەوەی نەوێتو دوابـ کەوێت" نەی فەرموە بوەستێ(یتوقف) چونکە وەستان ئەوپەڕی دواکەوتنە.

**بەکورتی:**

لەراستیدا نیشانەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو لەقورئانی پیرۆزو لەسوننەتی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾زۆرن، ئێمەیش لەپێشەوە نیشانە گرنگەکانمان باس کردوەو دەکرێ لەدوو وشەدا کورتیان بکەینەوە کەئەمانەن: دڵسۆزی، دڵسۆزی نواندن کە هەرهەموو ئەو نیشانەو سیفەتە ئاینیە خوازراوانە وەك لەخواترسانو پارێزگاریو رەوشت دەگرێتەوە، پسپۆڕیش هەموو ئەو پێداویستیانە دەگرێتەوە کە کاریگەریان هەیە لەکاری بانگەوازدا، وەك زانستو مەعریفەو داناییو ئەزمونەکان، بەجۆرێ کە بانگخواز بەشێوەیەکی بەرچاو روون بەحیکمەتەوە ببێتە رێنیشاندەرو پشوو درێژو لەسەر خۆ بێت، ئامانجی ستراتیژی هەبێت.

## پایەی دووەم: بانگکراو

بانگکراو ئەو کەسەیە کە بانگخواز هەڵدەستێ بەبانگکردنی بۆلای ئیسلام، یان بۆ پابەند بوونی تەواو پێیەوە، کاتێك دەگەڕێینەوە بۆلای قورئانی پیرۆز دەبینین کە بەروونی بەرنامەیەکی وردو ڕێكو پێکی داناوە کەلەسەر فیقهی لەپێ شترو گرنگتر(الاولویات) و لەسەر فیقهی پلەبەندی راوەستاوە ئەویش بە بەرنامەیەکی وردو ڕێكو پێكو قووڵ، والێرەدا ئەو بەرنامە یە لەم چەند خا ڵەدا کورت دەکەینەوە:

1- **دەبێ بانگخواز لەخۆیەوە دەست پێ بکات:** دەبێت خۆیی لەبیر نەچێتەوەو بەردەوام خۆی بانگ بکات بۆ پاککرد نەوەی دەروون، بۆ گۆڕان کاری، بۆ چاکبونو نوێبونەوە، ئینجا لەدوای خۆی لەماڵو خێزانو مندا ڵەکانی خۆ یەوە دەست پێبکاتو دواتر بگوێزێتەوە بۆ خزمو کەسو کارە نزیکەکانیو پاشتریش بۆ نێو گشت خەڵکی.

خوای گەورە دە فەرمووێت: ﴿**كَ بُرَ مَقْ تاً عِ ندَ الل لَّهِ أَن تَقُو لُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ**﴾**الصف**3 واتە: " ئەی نازانن ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە خوای گەورە زۆر رقی هەستێو خەشمو قینی بجولێو تۆڵەتان لێ بسێنێت کاتێك کە شتێکی چاك دەڵێنو بڕیارێکی چاك رادەگەیەنن بەلاّم ئەنجامی نادەن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿**أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَ نتُمْ تَتْ لُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ**﴾**البقرة**44. واتە: " ئەوە چیەو بۆچی ئێوە دەچن فەرمان دە کەن بە خەڵکی کە چاکەکار بن کە چی لە هەمان کا تدا خۆتان تان لەبیردەچێتەوە؟" وەدەفەرمووێت: ﴿**قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَ كَّى**﴾**الأعلى**14. وا تە: " بەراستی وایەو هیچ گومانی تێدا نیە ئەوکەسەی کە دەرونی خۆی پاك دەکاتەوە

لەپیسیو لەگوناه ئەوا سەرفرازو سەرکەوتووە". لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: **﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾ طه**132. وا تە: " فەرمان بەماڵو خێزانت بدە نوێژ بکەنو ئارامگربە لەسەر ئەو فەرمانەتو لەسەر ئەوان هەتا راد ێن لە سەری". هەروەها دە فەرموێت: **﴿وَأَ نذِرْ عَ شِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾الشعراء**214 واتە:" ئێ سلام بەخزمو کەسو کارە نزیکە کەت بگەیەنەو هۆشداریان بدەرێ لەسزای ئاگری دۆزەخ". وەدە فەرموێت: **﴿وَإِ نَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾الزخرف**44 واتە:" ئەم قورئا نە رێنما کارو یادەوەریە بۆ خۆتو بۆ قەومە کەت، دوا جاریش لێپر سینەوەتان لێدەکرێت لەسەری کە ئایا پابەند بوون پێیەوە یان نا".

هەروەها لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِ لَّا كَا فَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَ مُونَ﴾ سبأ**28. وا تە:" ئەی موحەمەد ئێمە تۆمان رەوانە کردوە بۆسەرجەم خەڵکی سەر زەوی لە هەموو سەردەمەکاندا تاکۆتایی دنیا، موژدە بەخشین بەئیماندارانو بێدارکەرەوەین بۆ هەموو مرۆڤەکان، بەڵام زۆربەی خەڵکی دەرکی ئەم راستیە ناکەنو لێیی تێ ناگەن".

2- **دەبێ شارەزاو ئاشنا بێت لەسەر بانگکراوەکە** (تاك یان کۆمەڵ، گەل بێت یان نەتەوە چوون یەکە)

پێویستە بانگخواز زانابێت بەکۆمەڵێ زانیاری کە لەبانگراودا هە یە وەك زانیاری لەسەر کەسایەتیو خێزانیو ژینگەییو کۆمەڵایەتیو ئابوورییو ئاینیو دەروونی، کە هەر بانگکراوێك خۆی بەخۆی ئەم زانیاریانە تیایدا جیاوازن لەوەی لەبانگکراوێکی تردا هەن...

ئەو زانیاریانە بۆبانگخواز کلیلی سەرەکین بۆ ئەوەی بانگخواز بەهۆیەوە بچێتە نێو کۆمەڵگاو کاریگەری هەبێت لە سەری، لەدوای ئەمەیشەوە بانگخواز پێویستی بەهونەری سوود وەر گرتن لەو زانیاریانە هەیە بۆ چۆنێتی وەبەرهێنانیان بۆ بەرژەوەندی بانگەوازەکەی.

لێرەدا دەڵێین دەبێ بانگخواز بزانێ کەپێویستی بەکلیلی دڵە جۆراوجۆرەکان هەیە، وەچۆنیەتی کردنەوەی دەرگای ئەو دلانە چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین کە لەدەرگاکانەوە بچینە نێو ماڵەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ...**وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا** ....**البقرة**189. مەعلومیشە کە دڵ گرنگترو زۆرترینی ماڵەکانە کە پێویستی بەزانینی کلیلەکەیەتی، دەکرێ ئەو کلیلە کلیلێکی مژدە بەخشو مژدە دەر بێت، لەوانەیشە کلیلێکی وریاکەرەوەو هەڕەشەو ترسێنەر بێت، دەکرێ ئەو کلیلە گوتەیەك بێت، دەیشکرێ کلیلی کرداری یان پێشەنگی بێت، یان... تادوایی.

3- دەبێ بانگخواز بانگکراوەکان پۆلێن بکات: چەند جۆرێ بانگەوازمان هەیە کە بۆغەیرە مسوڵمانانە، جۆرێکی تریش بۆ مسوڵمانانە، جگە لەوەیش غەیرە مسوڵمانەکان جۆراو جۆرن، هەیانە بێباوەڕەو هاوەڵدارە هەشیانە خاوەن پەڕاوی ئاسمانیە، هەیانە تەواو بێ باوەڕەو ئیقرار بەبونی خوای گەورە ناکات، ئیقرار ناکات بەبوونی ئایین، لەوەیش زیاتر لەنێو ئەو غەیرە مسوڵمانانەدا هەیە کە زانایەو بیرمەندە، هاوکات کەسانی نەفامو رەشە خەڵکیشیان تێدایە.

لەم روانگەیەوە دەڵێین ئەو بانگەوازەی کە ئاراستەی غەیرە مسوڵمانەکان دەکرێت فرە شێوازە لەتوێژێکەوە بۆ توێژێکی تر بەپێی جۆری توێژە کە

دەگۆڕێ، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، هەریەك لەو کەسانەیش کلیلی تایبەت بەخۆی هەیە کەببێتە هۆی کردنەوەی دڵو هزری.

هەروەها مسوڵمانانیش فرە جۆرنو لەیەك ئاستدا نین ئەویش بەپێی مەعریفەو زانستەکان، وەبەپێی عەیبەو کەمو کوڕیو هەڵەو هۆشیار کردنەوە، بەپێی پلەو پایەکان دەگۆڕدرێن، تیایاندایە کە تازە مسوڵمانە، کەسانی تریشی تێدایە کە فەرهەنگو کلتوری دەرەکی کاریگەرە لەسەریان، هەشیانە.....تادوایی.

لەلایەکی تریشەوە دەبێ بزانرێت جۆری ئەو نەخۆشیەی کە لەکەسی بانگکراودا هەیە کاریگەرە لەسەر نواندنی جۆری چارە سەرکە، بۆ نمونە چارە سەری سەرپێچیو تاوانە کردارییەکان جیاوازە لەچارەسەری تاوانە هزریەکان، یان ئەو تاوانانەی کە لەبواری بیروباوەڕو بیئەکانەوە دەکرێت.

**بەکورتی:**

لەراستیدا بانگکراو وەك نەخۆشێك وایە، دەبێ بانگخوازیش وەك پزیشکێکی حەکیمو دانا وابێت، خاوەنی بەزەییو دڵسۆزیو نەرمو نیانی بێت، بە پەرۆش بێت لەسەر پێدانی چارەسەر، دەبێ بزانێ چ جۆرە چارە سەرو دەرمانێکی پێویست بنوێنێت بۆی، نەخۆشی واهەیە پێویستی بەنەشتەرگەری هەیە تاچارەسەر بکرێت، نەخۆشی وایش هەیە پێویستی بەدەرمانی چڕو پڕو قورس هەیە، هی وایش هەیە دەرمانی کەمو سوکی پێویستە، هی تریش هەیە هەر بەچارەسەری سروشتی چارەسەر دەکرێت، نەخۆشیەکانی دڵو دەرونیش بەهەمان شێوەنو چارەسەری جۆراوجۆریان دەوێت.

بۆیە دەبینین کە وەلامەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ پرسیارکەرەکان جۆراوجۆرنو لەکەسێکەوە بۆکەسێکی تر کەجیاواز بوبێ لەکەسێکی تر گۆڕدراون.

بۆ نمونە لەبارەی ماچ کردن بۆ کەسێکی بەرۆژوو کە ئایا دروستەو رۆژو بەتاڵ ناکاتەوە فەرمویەتی﴿ﷺ﴾ بۆ کەسێکی بەتەمەنو بەساڵا چوو رێگا پێدراوە بەلاَم رێگای بەگەنجێك نەداوە ئەو کارە بکات[1] . یان لە شوێنێکی دورەوە کەماوەیەك رێگای بڕیوە پیاوێك دێتە خزمەتیو پرسیاری لێ دەکات کەبە چی دەچێتە بەهەشتەوە، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾دەفەرموێت (تورە مەبە)[2] چونکە ئەو نەخۆشیە مەترسیدارەی کە تیایدا بوە بریتی بوە لەتوڕەیی.

بەهەمان شێوە چەندین نمونەی تری زۆرو جۆراوجۆر لەم بوارەدا هەن.

## پایەی سێیەم: بابەتی بانگەوازەکە

بابەتی بانگەوازەکە بریتیە لەئیسلام، بەشێوەیەکی گشتی بۆ بانگەواز کردنی غەیرە مسوڵمانانە، بەدرێژیو بەتەواوی وردەکاریەکانیشەوە بۆ مسوڵمانانە.

مەعلومیشە کەئاینی ئیسلام پێك دێت لەباوەڕو لەشەریعەت(واتە: ئەحکامەکان)وە لەبەها رەوشتیەکان.

لێرەدا نامەوێت بچمە ناو وردەکاریو تایبەتمەندیەکانی ئیسلامەوە، چونکە ئەم بابەتەمان لەوبوارەدا نیە، ئەوباسی وردەکاریو تایبەتمەندیانە لەکۆمەڵە کتێبێکی زۆردا بەدرێژی باس کراوە، بەڵکو ئەوەی کە دەمەوێت لێرەدا بەکورتی باسی لێبکەم بریتیە لە: چونیەتی نمایش کردنو پیشاندانی ئیسلامو کاتی گونجاو بۆ ئەو نمایش کردنە.

---

[1] رواه ابوداود (2389).

[2] رواه البخاری(6116)، رواه الترمزي(2020)

بۆچۆنیەتی نمایش کردنەکە ئەوا پەیوەستە بەبلیمەتی‌و زرنگی‌و حیکمەتی بانگخوازەکەوە، پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە کە بانگخواز وەك پزیشك وایە، یاساکانی ئیسلام‌و بەهاو باوەڕەکانی دەرمانی چاککەرەوەو سارێژکارن، بانگخوازیش وەك پزیشك ورد دەبێتەوە لەنەخۆشەکەی تابزانێ چ دەرمانێك گونجاوە بۆی‌و ژەمی خواردنی دەرمانەکەی بۆ دیاری دەکات، هەر لێرەوە دەبینین کەئیبن قەییم کتێبێکی بەنرخی ناوناوە بە(دەردو دەرمان) یان (وەلأمی تێرو تەسەل بۆ ئەوکەسەی عەودالی دەرمانی سارێژکارە)دواتریش لەبارەی چارەسەرەوە کۆمەڵێ فەرمودەی هێناوە[1] کەبەم گوتەیەی خوێندنەوەیان بۆ دەکات‌و دەڵێ: (ئەمە دەرمانێکی گشتگیرە بۆ دڵ‌و رۆح‌و جەستەو سارێژکارە بۆیان، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نەزانی بەدەردو نەخۆشی وەسف کردوە، دەرمانی ئەونەخۆشیەش بریتیە لەپرسیارکردن لەزانایان، ئەوەبوو کەسێك سەری زامدار بوبوو هات پرسیاری لەکەسێك کرد ئایا ئاو بەکاربهێنێ‌و خۆی بشوات. بەوە فتوایان بۆدا کەخۆی بشوات ئەوەبوو کابرا خۆی شۆری و مرد، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بەوکەسە فەتوا دەرەی فەرموو: " کوشتیان، خوا بیانکوژێ، ئەی هەروەك خۆیان نەزان بوون نەدەبوو بێن پرسیار بکەن؟ شیفای دەردی نەزانی پرسیار کردنە.)[2]

[1] لەسەرەتاوە هەندێکیان باس کراون

[2] احمد(330/1)، ابو داود(336/1-337)، ابن ماجە (2572/1)

## پایەی چوارەم: گەیاندن و گوزارش لێکردن و پێ ڕاگەیاندن

مەبەست بەم پایەیە ئەوەیە کە بانگخواز هەستێت بەگەیاندنی هەموو ئیسلام یان هەندێکی بەکەسی بەرانبەر لەرێگای هۆیەکانی گوزارش لێکردنی بەگوفتار، یان نوسین، یان کردار، یان ئاماژە پێکردن.

دەکرێت ئەو هۆیانە بەراستەوخۆ بن، یان لەرێگای ئامرازە نوێیەکانەوە وەك تەلەفزیۆن یان رادیۆ یان ئەنتەرنێت، وەدەکرێت لەرێگای فیلمەکان و زنجیرە فیلم و شانۆگەریەکان و هاوشێوەکانیانەوە بکرێت.

پێش ئەوەی بچمە وردەکاری ئەوەی کە لەپێشەوە هاتوە حەزدەکەم ئاماژە بدەم بەگرنگێتی وشەو هۆیەکانی گوزارش لێکردنی لەئیسلامدا، کە لەرووی هاتنە نێو ئیسلامەوە یان دەرچوون لێی رۆڵی گەورەی پێدراوە، هەروەها لەرووی پابەند بوون پێیەوە یان خۆداماڵین لێی، لەرووی کاریگەرێتیی و ئەو ئاسەوارانەی کە بەدوای خۆیدا دەیهێنێت، ئەو کەسەیش کە گوفتاری لەگەڵدا دەکرێت، بەگوتاری گشتگیریش گوزارش لەوتە دەکرێت.

گوتاری ئیسلامی بریتیە لەپەیامی ئیسلام بۆ مرۆڤ ئیتر ئەو مرۆڤە مسوڵمان بێت یان غەیرە مسوڵمان، بەتەنها تایبەت نیە بەشێوازی بانگەوازەکەوە، بەڵکو گوتارێکی گشتگیرەو سەراپای ئیسلام دەگرێتەوە، بریتیە لەوگوتارە خواییە کە ئاراستەی سەرجەم مرۆڤایەتی کراوە.

گوتاری ئیسلامی بریتیە لەهەوڵ و کۆششێکی لێبڕاوانە بۆدانانی ئەوگوتارە لەچوارچێوەی راستی خۆیدا تاکاریگەری هەبێت ئەویش لەرێگای سوود وەرگرتن لەهۆکارە تەکنیکیەکانی سەردەم بەتەواوی پرشنگدانەوەو ئامرازو هۆکارەکانیەوە، لەرووی شێوازو داڕشتن و ناوەڕۆکەوە، وەلەرووی جۆری قسە

بۆکەرو کاتو شوێنەوە، هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ئاماژەی پێکردوە لەفەرمودەیەکیدا کەئاراستەی مەعازی کوڕی جەبەلی کردوە ئەویش کاتێ ناردی بۆیەمەنو پێی فەرموو: (تۆ دەچیتە لای قەومێك کە خاوەن پەڕاون دەبا یەکەمین شتێك کە بانگەوازیان دەکەیت بۆی شایەتومانی" لاالە الا اللە محمد رسول اللە" بێت)[1]

حافیز ئیبن حەجەر لەباسی هۆکاری دەستپێکردن بەم گوتەیە[2] دەڵێ: (ئەوە وەك دەستپێکێ وایە بۆ ئامۆژگاریکردن بۆئەوەی هیممەتو توانای خۆی لێبڕوانە کۆبکاتەوە بۆی چونکە خاوەن پەڕاوەکان بەگشتی خاوەنی زانستن‌و جۆری ئەوگوتارە کە ئەوانی پێ دەدوێنێت جیاوازە لەوگوتارەی کە نەفام‌و بت پەرستەکانی پێ دەدوێنرێت.)

---

(1) البخاری (1458)، مسلم(19).

(2) فتح البخاری (358/3) **لەشەرحی فەرمودەی**(1496)

# پێکەوە گرێدانی ڕەسەنایەتیو هاوچەرخی لە بانگەوازدا

لەراستیدا گوتاری بانگخوازی سەرکەوتو ئەو گوتارەیە کە هەردوو چەمکی ڕەسەنایەتیو چاوچەرخی پێکەوە گرێ دەدات، ڕەسەنایەتی لەرووی پشت بەستن بەڕیشکە شەرعیەکان، هاوچەرخیش لەرووی پەیوەندی بانگخوازەوە بەو چەرخەوە کەتیایدا دەژی، بەسەردەمی کردنی گوتاری ئیسلامی بریتیە لەسوود وەرگرتن لەهەموو ئامڕازە تەکنیکیەکانی سەردەمو کاریگەرێتیان بۆ ئەوەی پەسەندو کاریگەر بیٚو ڕۆڵی خۆی ببینیٚو بتوانیٚ کاربکاتە سەر دڵو دەرونەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: **أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاء ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ إبراهيم**( 24-25 ). واتە: " ئەی مرۆڤ ئایا سەرنجی ئەم نمونەیە نادەیت کە خوای گەورە دەیهێنێتەوە بۆقسەی چاكو گوفتاری دروستو نەخشەو بەرنامەی بەجیٚ، کەوەك درەختی چاكو جوانو بەردارو پڕخێرو بەرەکەت وایە، چاك ڕەگی داکوتاوە بەزەویداو مەحکەم وەستاوە، لقو پۆپو گەلاٚی ، بەروبومی بۆنخۆشو تام خۆشو ڕەنگ جوانی بەئاسمانو بڵندیدا پەخش بوەتەوە، ئەو درەختە هەموو کاتو هەموو دەمێك بەویستی پەروەردگاری بەروبومی دەبەخشیٚ، خوای گەورە ئەم نمونانە بۆ خەڵکی دەهێنێــتەوە بەڵکو یادەوەری وەربگرن"

لەم ئایەتە پیرۆزەوە ئەوە تێدەگەین کە گوفتاری چاكو کاریگەر ئەو گوفتارەیە کە لەرێگای بەستنەوەیەوە بەوەحیەوە ریشكو ئەسڵێکی جێگیرو دامەزراوی هەیە، لەدوو توێی مێژووی دوورو درێژیانەوە کە مێژووی بانگخوازانە

هەرلەئادەمەوە تا کۆتا پێغەمبەر(ﷺ)و بانگخوازە چاکەخوازەکانی تریش کە لەسەر رەویەی ئەو پێغەمبەرانە بوون دەبینین کە ریشکێکی بەهێزو پتەوی هەیە، لقەکانیشی لە ئاسمانن‌و لق‌و پۆپەکانی تر دەشەکێنێتەوەو هەوای سازگار هەڵدەمژێ، بەم شێوەیەش تادێ قەشەنگترو سەربەرز تر دەبێ، ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ گرنگێتی کەش‌و هەوای ئازادی‌و گرنگێتی فراوان بوون‌و بلاۆەکردن‌و پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تردا، هاوکات ئاماژەیە بۆ نوێبونەوەی گوتاری بانگخوازی‌و میانەیی تیایدا، هەروەك چۆن لق‌و لقە بچوکەکان لەدرەختێکدا بلاۆە دەکەن‌و پەخش دەبن‌و نوێ دەبنەوە.

هەروەها لەم ئایەتە پیرۆزەوە ئەو گرنگێتیە تێدەگەین کە دەبێ ئەو گوتارە بەرهەمدار بێت‌و سوود بەکەسانی تر بگەیەنێت، ئەمەیش ئەوە دەخوازێت کە پلانرێژی‌و پێداچونەوەو چاودێری‌و بەدواداچوونی بەردەوام هەبێت، هەروەها ئەوەی لێ تێدەگەین کە دەبێت گوتارێکی بەردەوام‌و پشوو درێژو سوودی درێژی هەبێت، هەروەك لەدوو توێی فەرمودەی خوای گەورەوە (کل حین) دا هاتوە، نابێ گوتارێکی کاتی بێ‌و بەرهەمی کاتیش بدات، دەبێ بەردەوام بێت، هاوکات ئەوەیشی لێ تێدەگەین کە پێویستە دەرەنجامی بانگەوازەکە ببەسترێـتەوە بەرەزامەنی‌و ویستی خوای گەورەوە.

بەهەمان شێوە پێویستە گوتاری ئیسلامی هەر لەسەرحاڵ‌و باری جارانی پێشتری نەمێنێتەوە بەڵکو دەبێ لەشێوازو مانادا، لەشوێنگەو بەپێی کەسەکان، کات‌و شوێن‌و بارودۆخ‌و بەپێی هەل‌و مەرجەکان لەگۆڕانی بەردەوامدا بێت، لەسەر ئەمەش چەندین بەڵگەی بەرچاومان لەقورئان‌و سوننەتدا هەیە، کە دادەنرێن بەبەهێزترین بەڵگە لەسەر گۆڕانی گوتاری بانگخواز بەپێی هەل‌و

مەرجەکانو خواستە نوێیەکان کە قورئانی پیرۆز خۆی شایەتحاڵی ئەم گوتەیەیە، بۆ نمونە ئێمە دەبینین کە گوتاری قورئانی مەککی (واتە لەپێش کۆچکردن بۆ مەدینە) جیاوازە لەگوتاری قورئانی مەدەنی کە بریتیە لەفەرمان کردن بەچاکە، هەرکەسێکیش قورئان بخوێنێــتەوەو خوێندبێتیەوە بەروونی ئەوەی لاچەسپاوەو لای جێگیر بووە کە بابەتی سورەتە مەککیەکان جیاوازە لەبابەتی سورەتە مەدەنیەکان  بەگشتی، شێوازی قورئانی مەدەنیش جیاوازە لەشێوازی قورئان مەککی.

بابەتەکانو باسەکانی قورئانی مەککی بەگشتی بەدەوری چەسپاندنی باوەڕدا دەخولێنەوە، هەرلەیەکتاپەرستیەوە بەهەموو بەشە جۆراوجۆرەکانیەوە تاسەلماندنی پێغەمبەرایەتیو پاداشت لەرۆژی دواییداو باوەڕ بوون بەغەیبو بانگهێشت کردنی خەڵکی بۆ کرداری چاکەو بۆ رەوشتە بەرزەکان، چیرۆکی پێغەمبەرانو باوەڕدارانیش لەبەرپەرچدانەوەی سەرپێچیکاران راستێتی ئەم گوتەیە دەسەلمێنن، بابەتەکانی قورئانی مەدەنیش بەزۆری بەدەوری دامەزراندنی کۆمەڵگای باوەڕدارو یاسا دانان دەخولێتەوە، لەبەرئەوە دەبینین کە قورئانی مەککی بە( **ياايها الذين امنوا** ) نەهاتۆتە خوارەوە، بەڵکو هەرهەموو ئەوەی کە کۆمەڵگای مسوڵمان پێویستی پێیەتی لەپەرستشەکانو مامەڵەو یاساکاندا لەسورەتە مەدەنیەکاندا دەبینرێن، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە دەبینین کە شێوازی قورئانی مەککی بەگشتی جیاوازە لەشێوازی قورئانی مەدەنی، شێوازی قورئانی مەککی زبریو توندی زاڵە بەسەریداو ئاوازو دەنگی گەیاندنی خێراو بەپەلەیە هاوکات هەندێ لەپێویستیەکانی گوتارو دواندنەکە دووبارە بونەوەی تێدایە، هەروەك لەسورەتەکانی (الشعراء، القمر، الرحمن، المرسلات) دا

بەدی دەکەین: دڵەکان دەدوێنیّو هەستەکان دەبزوێنیّو رووبەرووی ملهوڕی دەبێــتەوەو کەسی بەرهەڵستکاریش بۆڕ دەدات.

ئەمە بەپێچەوانەی شێوازی قورئانی مەدەنییە کەشێوازێکی فێرکارو یاسا دارێژ لەخۆ دەگرێت، شێوازێکی دەروون ئارامو هێمنە، بەئاوازی هێمنو لەسەر خۆ دڵەکان دەدوێنیّ. (یەکەمین شت دڵەکان دەدوێنیّو شوێنێکی نیە خاڵی بێت لەدواندنی دڵەکان، چونکە بابەتو باسەکانی بەدەوری یاسادانانو فێرکردندا دەسوڕێنەوە)[1]

ئەگەر ئێمە بەوردی بیر بدەینە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرو﴿ﷺ﴾لێیان تێبگەین ئەوا دەبینین ئەو رێگایەی کە دەبێتە هۆی ئەوە کە گوتاری بانگخوازی کاریگەر بێت دەبێت ئەم مەرجو سیفەتانەی لای خوارەوەی لەخۆ گرتبێت:

1- دەبێت لەسەر دیدی رۆشنو بەرچاو روونی بێت، واتە: لەسەر پلانی ستراتیژیو تێڕوانینێکی روون بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**﴾**يوسف**108 لەراستیدا وشەی (**بصيرة**) وشەیەکی گشتگیرە واتە فیقهی بانگەواز بەمانا گشتگیریەکەیو پلانو فیقهی سەرەنجامەکانو هاوشێوەی تری ئەمانەی پێشەوە.

2- دەبیّ دانایی بەخەرج بدات لەبەرکارهێنانی ئەقڵو سود وەرگرتن لەهەموو ئەزمونەکانو زانستو هونەرە کاریگەرەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**يُؤتِي**

---

[1] خطابنا الاسلامی في عصر العولمة/ الشیخ العلامة یوسف القرضاوی

**الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ** **البقرة**269.

3- دەبێ لەسەر رێنمایی‌و ئامۆژگاری چاك‌و سوود بەخش دامەزرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ... **وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ** **النحل**125. واتە سوود وەرگرتن لەسۆزداری.

4- دەبێ بانگەوازەکە لەسەر چاکترین شێوازی گفتوگۆ دابمەزرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ... **وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ** **النحل**125 لەئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: **وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ** **العنكبوت**46.

خوای گەورە ئەم سێ سیفەتەی لەیەك ئایەتدا کۆکردۆتەوە دەفەرموێت: **ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ** **النحل**125.بەواوی کۆ (جمع)یش ئەوە دەخوازێت کە دەبێ لەدوو توێی بەرنامەیەکی میانڕەودا رەچاوی هەموو ئەم سیفەتانە بکرێت، لەبەرئەوە هیچ حیکمەتێك لەوەدا نیە کەبەبێ بوونی هیچ هۆیەکی رەواو ژیرانە بێین هەست‌و نەستی کەسانی غەیرە مسوڵمان بوروژێنن‌و سۆزیان بریندار بکەین، بالێرەیشدا بێین سەیری ئەو گوتارە جوان‌و پڕ لەدانایی‌و کورتە بکەین کەلەیەکێ لەدەرچوانی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیەوە ئاراستەی کەسانی غەیرە مسوڵمان کراوە: ئەوەبوو کە رەبعی کوڕی عامیر کاتێ چووە لای رۆستەمی کیسرای فارس وتی: (ئێمە خوای گەورە بۆ ئەوە رەوانەی کردوین تاخەڵکی لەبەندایەتی بەندەکان رزگار بکەین‌و بیانخەینە سەر پەرستن‌و بەندایەتیکردن بۆخوای بەندەکان، لەبەرتەسکی‌و تەنگەبەری دنیاو ستەمی باوەڕو ئاینیەکان دەریان بهێنن‌و بیانخەنە نێو دادپەروەری ئیسلامەوە)[1]

[1] تأريخ الطبرى (518/3)

زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ ئێمە لەبەردەم دوو گوتارداین کە هەردوکیان زیانمەندن بۆ ئوممەتی ئیسلام: (گوتاری زیادەڕەو توندوتیژو زبر) کە زیانێکی گەورەی بەئوممەتی ئیسلامی گەیاندووە، وەگوتاری (دەرچونو بەرەڵاێو بەتاڵاێن بردنی ژیاری)و هەر گوتارێکی تریش کە پابەند نیە بەدەقە شەرعیەکانەوەو رێز لە پێشەوایانی بەرێز ناگرێ، بەڵکو بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئاییینەکەمانو نەژادو بەهاکانمان بگۆڕین، لەبەرئەوە بوەتە ئەرکی سەرشانمان کە مەشخەڵەکانی بەرنامەی میانڕەوی لەگوتارماندا بخەینە روو و زەقیان بکەینەوە.

5- دەبێ ئەو گوتاری بانگخوازییە بەهەمان زمانی ئەو قەومو کەسانە بێت کە بانگهێشت دەکرێن بۆلای ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێت: **وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ اللّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ إبراهيم4**. واتە:" ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان رەوانە نەکردوە کەبەزمانو شێوازی قەومەکەی ئاخاوتنی لەگەڵ نەکردبن، بۆئەوەی جوان پەیامەکەی روون بکاتەوە بۆیان" مەبەستیش بەزمانی قەومەکە ئەوەنیە کەتەنها بەزمانی خۆیان گوفتاریان لەگەڵدا بکات، بەڵکو دەکرێ بەهەر شێوازێکی تریش لەهەموو بوارەکانی تردا گوفتاریان لەگەڵدا بکات بەجۆرێ شیاوی وەرگرتن بێتو پێیان قبوڵ بێت.

6- دەبێت ئەو گوتارە لەخودی دەرگای ماڵەکانەوە بچێتە ناویان، خوای گەورە دەفەرموێت: .....**وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا** ..... **البقرة**189. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت گوتاری بانگخوازی رەچاوی بارودۆخەکانو حاڵی بانگکراوەکان بکات، جا هەروەك چۆن هەر دەرگایەك کلیلی بەخۆی هەیە، هەموو گەلێکیش هەروەهایە، یان هەر تاکە کەسێکیش هەروایە،

کلیلی تایبەت بەخۆی هەیە تادڵی ئەو گەلە یان ئەو کەسە بکاتەوە، کلیلی کەسێکی ئەوروپی جیاوازە لەکلیلی تاکێکی عەرەبی یان ئەفەریقی، بۆ هەموو گەلو کەسانی تریش هەر بەهەمان شێوەیە.

7- دەبێ رەچاوی فیقهی گرنگترو لەپێشترو فیقهی هاوسەنگ کردن بکات.

8- دەبێ رەچاوی نوێبونەوە بکات، واتە گوتارێك بێت لەگەڵ هەر گۆڕانێکی نوێو هەر سەردەمێکی نوێدا هاوتەریبی نوێبونەوە بکات.

9- دەبێت بەبەردەامی هەڵگری سیمای چاکسازیو زانست بێت، خۆی بڕازێنێتەوە پێیانەوە: خوای گەورە دەفەرموێت: ..... **إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ** .... **هود**88 . واتە:" ئەی پێغەمبەر بڵێ من تەنها مەبەستێك کەهەمە ئەوەیە کە بەپێی توانا چاکسازی بکەم".

10- دەبێ گوتارێك بێ لەبنەما سەرەکیو نەگۆڕەکانی ئاییندا جێگیرو دامەزراو و یەکلاکەرەوە بێت، لەمەسەلە گۆڕدراوەکانیشدا میانەییو گونجاندنی هەبێت.

هەرلەسەر ئەم دە مەرجو سیفەتەی پێشەوە شێخو مامۆستای رەوتی میانڕەوی لەم سەردەمانەدا روونی کردۆتەوە کە دەبێ ئەو گوتارە هەنگاوی پێ هەڵبگیرێو گواستنەوەی پێ بکرێت:

1- لەشێوەو رواڵەتو دیمەنەوە بگوێزرێتەوە بۆ حەقیقەتو ناوەرۆك.

2- لەقسەو مشتومڕەوە بگوازرێتەوە بۆ بەخششو کارکردن.

3- لەسۆزو پشێویو ئاڵۆزییەوە بگوێزرێتەوە بۆ ئەقلانیەتو زانست گەرایی.

4- لەلقو چڵەوە بگوێزرێتەوە بۆسەرو بنەما سەرەکیەکان.

5- لەگرانکاریو دوورخستنەوەوە بگوێزێتەوە بۆ ئاسانکاریو موژدە بەخشین.

6- لەچەقبەستوییو چاولێکەریەوە بگوازرێتەوە بۆ ئیجتیهادو نوێبونەوە.

7- لەدەمارگیریو داخراویەوە بگوێزرێتەوە بۆ لێبوردەییو هەنگاو هەڵگرتن.

8- لەزیادە ڕۆیی بێ دیسپلینیەوە بگوێزرێتەوە بۆ میانڕەویو هاوسەنگی.

9- لەتوندوتیژیو رقو کینەوە بگوێزرێتەوە بۆ سۆزو بەزەیی.

10- لەناکۆکیو دووبەرەکیو جیاوازیەوە بگوێزرێتەوە بۆ هاوپەیمانیو هاوکاریو رایەك خستن[2].

ئەم دە مەشخەڵو سیماو سیفەتەی لەپێشەوە ئاماژەمان پێکردن، ئەم ئایەتە پیرۆزەی کەدەفەرموێت: **ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ النحل** 125. جەختیان لەسەر دەکاتو دەیانکاتە سیمای بانگەوازی راستو دروست بۆلای خوای گەورە.

لێرەوە دەڵێن ئێمە ئەمڕۆ لەگوتاری ئیسلامی ناوخۆی خۆماندا بۆ تەواوی مسوڵمانانو کۆمەڵە ئیسلامیەکانو بۆ رێچکەو رێبازو ئاینزاکان بەهەر هەموو بەشو چاوگەکانمانەوە پێویستمان بەگوتارێکە کە هەمومان لەسەر پرنسیپە نەگۆڕەکان کۆبکاتەوەو بەهۆی شتە بەشو لاوەکیەکانەوە دوورە پەرێزو ناکۆك نەبین، هەروەك چۆن پێشەوا رەشید رەزا گوتەیەكو رێسایەکی ئاڵتونی باس کردوەو پێشەوا حەسەن بەنناش جەختی لەسەر دەکاتەوە، ئەو رێسایەی کە دەڵێ: (لەومەسەلانەدا کەیەك دەنگینو یەکڕاین هاوکاری یەکتر دەکەین لەسەر جێبەجێکردنیان، بۆ ئەوشتانەش کە یەك دەنگو یەك را نین لەسەری ئەوا باپاساوی یەکتریمان قبوڵ بێو لەیەکتری قبوڵ بکەینو مەعزەرەت بۆ یەکتری

(2) خطابنا الاسلامي في العصر العولمة/ د. يوسف القرضاوي

بێنینەوە) یان لەو مەسەلانەدا کەرای جیاوازمان هەیە لەسەریان لێبوردنمان بۆیەکتر هەبێت.

ئەوەی راستی بێت دوژمنانی ئیسلام لەسەدەی رابردوا هاتن هزری نەتەوەیی توندڕەویان بەکارهێنا ئەویش بەمەبەستی لێدانو پارچە پارچەکردنی یەکبونو یەکێتی جیهانی ئیسلام، لەئەمڕۆیشدا هەوڵدەدەن بدەن لەیەکبونو یەکڕیزی مسوڵمانان ئەویش لەرێگای وروژاندنی دەمارگیری تایفەگەری، کەزۆر بەداخەوە هەندێ لایەنو بەمەبەستی گۆڕینی رێچکەو مەزەب فوو دەکەن بەو دەمارگیریە قێزەونەدا.

لەبەرئەوە ئێمە (لەیەکێتی جیهانی زانایانی مسوڵمان)وریاو هۆشداری خۆمانمان داوەو دەیدەین، هەرکەسو لایەنێکیش بیەوێت ئەو کارە قێزەونە بکات ئاگاداری دەکەینەوە کە ئەوە یاریکردنە بەئاگر: ئاگری فیتنە گێڕیە بۆئەوەی سەرمان نەپڕژێتە سەر کێشە سەرەکیەکانمان، کە یەکەمینیان کێشەی فەلەستینو قودسی پیرۆزی داگیرکراوە لەنێوان جیهانی ئیسلامیدا، وەلەکێشەو مەسەلەکانی گەشەکردنی گشتگیرو ئاوەدانکردنەوەو گرتنە دەستی زانستو هۆکارەکانی پێشکەوتنی ژیاریو خۆشگوزەرانیو پێشکەوتنو بەرزبونەوە دورمان دەخەنەوە.

کەواتە ئێمە دەمانەوێت بگەینە دانانو دارشتنی کۆمەڵێ پرنسیپی نەگۆڕ کە پراکتیزە بکرێنو بخرێنە گەڕ، بۆئەوەی ببنە بەرنامەو میتۆدێكو بەڵگە نامەیەك بن بۆ لێکنزیکبونەوەی راستو دروست، هاوکات دەمانەوێت ئەو مەسەلە گۆڕدراو راو بۆچونانەی کە لەهەریەك لەکۆمەڵەکاندا هەیە پەرەیان پێ بدرێو فراوان بکرێنو میانەی جوڵەو گۆڕانیان تێدا بێت، بەهەمان شێوە

پێویستمان به بەرنامەیەکی گشتنگیر هەیە بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ غەیره مسوڵمانەکاندا(ئەوی تر) ئەویش لەسەر بناغەی  ریز لەیەکتر گرتنو پێکەوە ژیانی ئاشتیانەو وتوێژو یەکتر ناسین، هەورەها ئێمە پێویستیەکی ئێجگار زۆرمان هەیە بەبوونی بەرنامەیەکی تێروتەسەلو پێشتر دیراسەکراو هەیە بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ خۆرئاوادا، لەلایەکی تریشەوە پێویستیەکیو بنەڕەتیمان هەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەو گرفتەکانی لاوانو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەرووی مرۆیی، ئابوورییو گرفتەکانی هەژاری، هەلاْیسانو بێکاری ئەویش لەرێگای دانانی بەرنامەیەکی گەشەپێدانو ئابووریی هەڵکەوتوودا، هاوکات داڕشتنی بەرنامەیەکی فێرکاری کە بەهرەدارو داهێنەران بەرهەم بێنێت، کەواتە ئێمە پێویستمان بەو گوتارەیە کە هەموو ئامانجەکانمان بۆ بێنێتە دی.

# پرۆسەی گەیاندن

بۆ ئەوەی پرۆسەی گەیاندن بەشێوەیەکی راستو دروست جێبەجێ بکرێت ئەوا پێویستی بەسێ کاروفەرمانی گرنگ هەیە:

**کاری یەکەم:** هۆکاری گوزارشت لێکردن بەگوفتارو بەنوسین، بەجوڵەو بزافو بە ئاماژە، هۆکار لەزماندا بریتیە لەوشتەی کە بەهۆیەوە دەگەیت بەکەسی تر[1]، خوای گەورەیش دەفەرمویت: ﴿...**وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ** ....﴾**المائدة**35. واتە" هەوڵبدەن لەرێگای هەموو کارێکی چاکەوە رەزامەندی پەروەردگار بەدەست بهێنن"

هۆکار بریتیە لەو هۆیەی کە لەرێگای ئەوەوە پرۆسەی پەیوەندیو بەیەك گەیشتن لەنێوان بانگخوازو بانگکراودا جێبەجێ دەبێت، ئالێرەوە تەواوی هۆکارەکانی گوزارشت لێکردن بەکۆنو نوێیانەوە - هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد - دەچنە نێویانەوە کە بریتین لەهۆکارە بیستراوەکان وەك رادیۆو کاسێتی بیستراو، هۆکارە بینراوەکان وەك ئەو پەڕاوانەی کە چاپ دەکرێنو نەخشەو بلاْوکراوەی تر وەك وێنەکانو هاوشێوەکانیان هەروەها هۆکاری بیستراو بینراو وەك تەلەفیزیۆنو ڤیدیۆو هاوشێوەکانیان[2].

**لەم سەردەمەشماندا هۆکاری تەکنۆلۆژی سەردەمیانە زۆر بوونو پێویستە دامەزراوە بانگخوازییەکانو بانگخوازان بەکاریان بهێنن، لەگرنگترینیان:**

---

(1) القاموس المحيط، لسان العرب، المعجم الوسيط، مادة: وسل

(2) موضوع وسائل التعبير في كتابنا، مبدا الرضافي العقود – وكتاب الوسائل التكنولوجية المعاصرة في الخطاب الاسلامي: د. محمد مرعي . ل/263

1- هۆكارەكانی كارلێكی وەك كۆڕو قاوەخانەكانی ئەنتەرنێت، ژورەكانی وتوێژوو لێكدانەوەو لێكۆڵینەوە، پێگەكانی پەیوەندی كۆمەڵایەتی (فەیس بوك و تویتەرو...) بەستنی گۆنگرەیش لە دورەوە.

2- هۆكارەكانی پەیوەندی جەماوەری وەك لاپەڕەكانی ئەنتەرنێت، كەناڵە ئاسمانیەكان، رادیۆو رۆژنامەو گۆڤارەكان.

3- هۆكارەكانی پەیوەندی تاكە كەسی وەك نامەی سەر مۆبایل، لاپەڕە ئەلیكترۆنیە تایبەتەكان لەپۆستی ئەلكترۆنی، كۆبونەوەكان، گوتارو وانە وتنەوەو كۆڕ بەستن، بەرنامەكانی كۆمپیوتەر[3]

بانگخوازیش دەتوانێت سوود مەند بێتو سوودیش بەكەسانی تر بگەیەنێت ئەویش لەرێگای چوونە سەر ئەوپێگەو سایتانەو وتوێژ كردن لەگەڵ كەسانی تردا، ئەمەیش ئەوە دەخوازێ كە زانیاری پێویستو راهێنانی گونجاوی لەسەر ئەو هۆكارە تەكنیكانەی سەردەم هەبێت، واتە دەبێت بەتەواوی لەسەردەمەكەی خۆیدا بژیو لێی دانەبڕێ.

<u>كاری دووەم</u>: هۆكاری گوزارشت لێكردنو گەیاندن:

ئەم كارە هونەری گەیاندنی بانگەوازەو لەحەقیقەتیشدا زانستێكە، هونەرو بەهرەیە، خەڵكیش لەم كارەدا چوون یەك نین، هەیانە بەتوانایە لەسەر گوزارشت لێكردنو گەیاندنی بەشێوەیەكی زەوق ئامێزو كاریگەرو سەرنج راكێشو راكێشەرە، هەیشیانە ئەو توانایەی نیە، لێرەوە ئەركێكی قورس دەكەوێتە سەرشانی بانگخواز كە دەبێ راهێنان بكات لەسەر هۆكارە كاریگەرەكان،

---

[3] سەرچاوەی پێشوو. كتێبەكەی د. السید مرعی/ ل/266

ئاگادار بێت بەسەر بانگخوازیی گەورە بانگخوازە وتار بێژەکانو ئەدیبە کاریگەرەکان تابتوانێ سودیان لێ وەربگرێ، بەتەنیشت ئەمەوە پێویستە گرنگی تەواو بدات بەزانستەکانی گەیاندنو خستنە رووی بانگەوازو کارتێکرتن، بەزانستەکانی رەوانبێژیو زانستی ماناو بەدیعو دەروونناسی بەتایبەتی دەروونناسی پەروەردەیی، کۆمەڵناسی، شێوازەکانی وانە وتنەوە، زانستی راگەیاندنو هونەرەکانی، پێویستە سوود وەربگرێت لەشێوازە سەردەمیەکان لەرووی خستنە پێش چاو و شەوق پەیدا کردنو هۆکارە کاریگەرەکانی تر وەك ئاوازی گونجاو و جموجۆڵی لەبارو پێویستو ئاماژە کردن، بەهەمان شێوەیش سوود وەربگرێت لەئامێرە نوێیەکان وەك کۆمپیوتەرو ئەوانی تریش.

لێرەوە دەرك دەکەین بەهونەری ئیعجازی روونکردنەوە(البیانی) لەقورئانی پیرۆزدا، کەخوای گەورە باشترو چاکترین شێوازی هەڵبژاردوە بۆ کۆتا پەیامی خۆی، کە بەرەهایی بەهێزترینو جوانترین شێوازی گەیاندنە، لەبەرئەوە دەبینین کە ئێجگار کاریگەر بوە لەسەر دەرونو لەسەر ژیریو دڵەکان، تەنانەت لەسەر ئاستی عەرەبە نەفامەکانیش.

جا لەکاتێکدا کە قورئانی پیرۆز گرنگی داوە بەلایەنی جوانی لە لەفزو لە ئاوازو پێشبڕکێ لە باوەڕهێنانداو گەیشتنەوە بەکاروانی باوەڕداران ئەوا لەهەمان کاتدا گرنگیەکی زیاترو گەورەتری داوە بەماناو مەبەستو بەڵگەی بەهێزو نیشانەو سەلمێنراوە رۆشنو نیشانە روونو قەناعەت پێکراوەکان.

بۆیە دەبێت شێوازی بانگخوازی هەموو ئەم چەمكو لایەنانەی خوارەوە لەخۆ بگرێتو هەرهەمویان گرێ بدات پێکەوە: هەر لە جوانی لەفزو رەوانبێژی و رێکخستنی پیتەکانو بەهێزی رستەو توندوتۆڵیانو پێکەوە گرێدانیانو مۆزیکی

پیتو وشەکانو ئاوازەکانیانو کاریگەری دەرەکیو ناوەکیانو پێکەوە بەستنی ڕستەکانو بەستنەوەی ڕەوشی ڕستەکان لەبڕینو پێکەوە گرێدانیان هەتا پارێزگاری کردن لەڕەوانبێژی ڕستەو ڕەچاوکردنی جوانی مانا ئاماژە پێکراوەکانی لە هاوسەنگیەکی تەواو و ئەوپەڕی وردەکاریدا بەبێ زیادەڕۆیی یان کەمتەرخەمی نواندن، دەبێ جوانی ماناو قەشەنگیو مەبەست پێکانەکە پێکەوە گرێبدات، دەبێ لەبەرکارهێنانیدا وردکاری بەخەرج بدرێت، مەبەستەکەی ڕوون بێت، ئەوەی دەیەوێت بیخاتە ڕوو، دەبێ لەگوزارشت لێێکردندا قوڵ دابچێو بەڵگەو سەلمێنراوەکانی بەهێز بن لەگەڵ ڕەچاو کردنی شوێنو پایەو گونجانی گوتارەکە لەگەڵ بانگکراودا، هەروەها دەبێ لەگوتارەکەیدا جەخت بکاتو گوتارەکەی چڕ بکاتەوە لەسەر حەقیقەتەکانو ناوکرۆكو خۆی دوور بگرێت لەشێوەو ڕواڵەت، دەبێ بایەخ بدات بەمەبستەکانو بیاندات بەسەر دیاردە بەرچاوو ڕواڵەتیەکاندا، ئاسانکار بێتو شتەکان لە خۆیو لەسەر بانگکراوەکە قورس نەکات.

بانگخواز پێویستی بەوەیە تێگەیشتنێکی قووڵی بۆ زانستەکانی ڕەوانبێژی (بلاغة)و هەردوو زانستی ڕوونکردنەوەو جوان نواندن (بیانو بدیع) هەبێت، دەبێ لەبەرکردنی باشی هەبێ بۆ زۆرێك لە شیعرو پەندو ئەدەبی بەرزو بەهادارەکان.

منیش بەو پێیە لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا ژیاومو لە بواری بانگەوازدا لێی وردبوومەتەوە ئەوەم تیایدا بینیوە کە تا ئەوپەڕی گرنگی داوە بە سروشتی شێوازی بانگەواز لە ڕووی جوانی شێوەو ڕواڵەتیو لە ڕووی مەعنەویەوە  هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکردووە  وە لەڕووی گرنگیدانی بەلایەنی

پەروەردەییو خۆ پاککردنەوەوە، خوای گەورە ئەرکی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾لەم بوارەدا روونکردوەتەوەو دەفەرموێ: ﴿**هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ**﴾**الجمعة**2. واتە: "ئەو پەروەردگارە خۆی لە نێو خەڵکێکی نەخوێندەواردا کەسێکی لە خۆیان هەڵبژاردوەو کردویەتی بە پێغەمبەرو رابەریان، ئایەتەکانی قورئانی بەجوانی بۆ دەخوێندنەوە، هەوڵ دەدا کە دڵو دەروونو کردارو گوفتاریان خاوێنو جوان بکات، وە فێری قورئانو داناییو شەریعەتو بانگەوازو خۆ راگریان بکات، هەرچەندە ئەوان پێشتر لە گومڕاییو سەرلێشێواویو سەرگەردانیو ستەمێکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو".

**ئەو ئەرکانەش ئەمانەن:**

أ/ خوێندنەوەی قورئان بۆ بالآبوونی رۆحو بەرزبوونەوەی.

ب/ پاککردنەوەی دڵو دەرونەکانو رزگارکردنیان لە نەخۆشیە مەعنەویەکان، پڕکردنەوەیان بەکارە چاکەکانو فەڕوبەرەکەتدارەکان، بەخشینی دڵ ئارامیو رەزامەندی پێیان بۆئەوەی دڵ لە ئارامیدا بژیو دەروونیش رازی بێتو پۆشاکی ئارامیو سەنگین بکرێ بەبەریدا.

ج/ پاڵنانو هاندانی ئەقڵەکان بۆ سود وەرگرتن هاوکاتیش سود پێگەیاندن لە حیکمەتو خوێندنەوەی کتێب، لە گەردوونو لە دەروون، لە ئەزموونەکان بۆ گەیشتن بە داهێنان کردن.

بۆیە دەبێ بانگەواز هەوڵو کۆششێکی بێ وچانو سەرومڕ بدات بۆئەوەی شێوازی بانگەوازەکەی گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی کەسی بانگکراودا، بە جۆرێکی وەها بێت کە شێوازی ئەقڵی لەگەڵ ئەقڵانیەکاندا بەکاربهێنێ، شێوازی

هەستیو هەستپێکراو لەگەڵ کەسێکدا بەکاربهێنێ کە ئەو جۆرە شێوازە کاریگەری دەبێ لەسەری، شێوازی سۆزداری لەگەڵ خەڵکە گشتیەکەدا، وەیان بێت هەردووکیان بەپێی پێویستو کاریگەری بوون لەیەکدا کۆ بکاتەوە، لەبەرئەوە دەبینین قورئانی پیرۆز لەبۆ یەك باسو بابەت زیاد لە جارێك شێوازی خۆی دەگۆڕێت، بۆ نموونە بونی تەنها حوکمێك جارێك کە دەفەرموێ **قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ** گوزارشت لە یەکتا پەرستی دەکات، جارێکی تریش دێت شتێك بەکاردەهێنێ کە ببێتە هۆی جولاندنی ئەقڵو قەناعەتی پێ ئەکات. دەفەرموێ : **لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ الأنبياء**22 واتە: "ئەو خەڵکە لاوازە بۆ بیر ناکەنەوە، ئەگەر لە ئاسمانەکانو زەویدا خوایەکی تر هەبوایە جگە لە خوای پەروەردگار ئەوە هەردووکیان وێران دەبوون، پاکیو بێگەردیو تەسبیحاتو ستایش هەر شایستەی ئەو خوایەیە کە خاوەنی عەرشو تەختی فەرمانڕەوایەتی تایبەتە لەبەرامبەر ئەو بیرو بۆچوونە نارێكو نالەبارانەی کە خوانەناسان باسی دەکەنو هاوەڵو شەریك بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن".

وە دەفەرموێت: **مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذاً لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ المؤمنون**91. واتە: "هەرگیز ڕەوانیەو ماقوڵو پەسەند نییە کە خوای گەورە کوڕو منداڵ بۆ خۆی بەڕەوا بزانێتو دروستکراوی خۆی بکاتە کوڕی خۆی!! هەروەها هەرگیز خوایەکی تریش هاوتاو هاوکار نییە، چونکە ئەگەر شتی وا ڕەوا بوایە، ئەوە هەر خوایەك بۆ خۆی دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوەو پاشان دەبوو بە کێشەیانو هەندێکیان هەوڵیان دەدا زاڵ بن بەسەر ئەوانی تردا!! پاکیو

بێگەردیو تەسبیحاتو ستایش هەرتەنها شایستەی خوای گەورەیەو رەوای (الله)یەو ئەو زاتە زۆر بە دوورە لەو باسو خواسانەی کە کاتی خۆی موشریکەکانی مەککە دەیانکردو ئێستەش مەسیحیەکان دەیکەن".

لەبەر ئەم هۆیە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾داوەو (لە رێگای ئەویشەوە بۆ هەموو بانگخوازان) کە ئەقڵو سۆزداری لە بانگەوازەکەیاندا بەخەرج بدەن، خوای گەورە دەفەرموێ: **ادْعُ إِلى سَبِيلِ** **النحل**125، خوای گەورە فەرمانی داوە کە دەبێ پێکەوە گرێدان هەبێت لەنێوان پێداویستیەکانی ئەقڵی ساغو بەبڕشت لەحیکمەتو لە هەر شێوازێکی سودمەندی تر کە کاریگەر بێت لەسەر ئەقڵی ئەوی تر وە لەنێوان پێداویستیەکانی سۆزداری دا: لەئامۆژگاریو رێنمایی باش کەئاراستەی دڵەکان دەکرێت، هەروەها جیاوازی خستووە لەنێوان وتوێژو دواندنی خاوەن پەڕاوەکانو لەنێوانی خەڵکانی تردا، دەبێ بانگخوازی سەرکەوتوو و بلیمەت ئەوپەڕی هەوڵو کۆشش بکات بۆ بەدەستهێنانی بڕێکی باش لە بەڵگەی روونو نیشانەی دیارو بەرچاو لە کاتێکدا کە دەکەوێتە وتوێژو مشتومڕ بەتایبەتی لەکاتی بانگهێشتکردنی بیرمەندانو ئەو کەسانەی تریش کە گرنگی دەدەن بە میتۆدە ئەقلّیەکان، ئەویش لە رێگای زۆر خوێندنەوەو سوود وەرگرتن بەتایبەتی لە میتۆدی ئەقلانی، راهێنان بکات لەسەر چۆنێتی گەیشتنە دەرئەنجامە ئەقڵیو سروشتیەکانو بەدەست هێنانیان، بۆئەوەی بتوانێ دادوەریی مەسەلە ئەقلّیەکانو مشتومڕو دیداری روبەڕووبوونەوە بباتەوە، دەبێ توانای هەبێ لەسەر نموونە هێنانەوەو پێوانە جۆراوجۆرەکان (لە پێوانەی روونو ئاشکراوە، بۆ پێوانەیی لە پێشتر، وە پێوانەی وێکچوون  یەکسان کردن لە نێوان دوو

مەسەلەدا  وە پێوانەی جیاواز (واتە: پێچەوانە)و ئەوانی تریش بەهەمانشێوە.) قورئانی پیرۆزو پێغەمبەری سەردارمان ﴿ﷺ﴾بەوپەڕی وردەکاریەوە ئەم پێوانانەیان بەکارهێناوە.[1] لە بەشی پێوانەیی لە پێشترو یەکەمەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**أَلاَ تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّواْ بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَؤُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ**﴾**التوبة**13 .واتە: (باشە ئێوە چۆن ناجەنگن دژی کەسانێك کە بەردەوام پەیمانو بەڵێن شکێن بوونو نەخشەیان کێشا بۆ دەرکردنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾لە شاری مەککە، هەموو جارێکیش هەر ئەوان دەست پێشخەر بوون لەدژایەتیاندا، مەگەر ئێوە لەوان دەترسن؟! دڵنیابن کە هەر خوای گەورە شایستەی ئەوەیە کە حیسابی بۆ بکرێتو لێی بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدارو ئیماندارن!!) لەم ئایەتە پیرۆزەدا دووجار پێوانەیی لەپێشترو یەکەمینی بەکارهێناوە، جارێك لە جەنگاندنی مسوڵمان لەگەڵ ئەوانەدا کە ئەوەی کردیان کردیانو دەست پێشخەربوون لە جەنگان لەگەڵ مسوڵماناندا، واتە جەنگانی موسڵمانان دژ بەوانە یاسای پێوانەیی یەکەمینی بەسەردا دەسەپێ، جاری دووەمیش لە مەسەلەی ترسدا، کە دەبێ ترسی مسوڵمانان تەنها بۆ خواو لە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو بەتواناو ستەم شکێن بێت کە ئەوە لە پێشترە لەوەی بێن لەو بێباوەڕانە بترسن.

پێغەمبەری خوایش ﴿ﷺ﴾لە زۆر شوێنداو زۆرجار پێوانەیی لە پێشتری بەکارهێناوە، بۆ نموونە بەو ئافرەتەی کە ویستی لە جیاتی دایکی حەج بکات فەرمووی: (قەرزی خوای گەورە لەپێشترە کە بدرێتەوە) [2]

---

[1] **تطبيقات الرسول (ص) للمنهج العقلى في الدعوة/ محمد بن عبدالله العثمان/ ل (**26 - 275**)**

[2] **رواە البخاري (**1953**)، مسلم (**1148**)، لە فەرموودەیەکی ئیبن عەبباسەوە.**

هەروەها لە سەر بانگخواز پێویستە کە پشت ببەستێ بە هەرشتێ کە کاریگەری لەسەر هەستو ویژدانو سۆز هەیە دڵو ناخی مرۆڤ دەجولێنێ، ئەویش لە ڕێگای هاندانو موژدە پێدانو یان وریاکردنەوەو ترساندنو هەڕەشەوە دوور لە هەڵلاّ نانەوەو گەورەکردن یان بە کەمو سوك سەیرکردنی، وە لە ڕێگای چیرۆکی کاریگەرو وتەی ناسکەوە، یان لە ڕێگای نواندنی بەزەیی‌و چاکەکردن لەگەڵ بانگکراودا، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿**فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّه لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ** ﴾**آل عمران**159 . پێشتر واتا کوردیەکەی هاتووە.

شاعیرێکیش دەڵێت: چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکە دڵیان دەکەیتە بەندەی خۆت، واتە دڵیان رادەکێشی بەلای خۆتدا، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە چاکە مرۆڤ دەکاتە بەندەی خۆی.

یەکێکی تر لە زانستو فیقهی بانگخواز ئەوەیە کە هەرکات پێویست بوو شێوازی جۆراوجۆرو نمونەی هەستپێکراو بەکاربهێنێ، بەتایبەتی لەگەڵ کەسانی کەم تەمەنو لاواندا، ئەوەتا لوقمانی حەکیم کە خوای گەورە شێوازی پەروەردەکردنی بۆ کوڕەکەیی تۆمار کردووە، هاتووە تەواو شێوازە ئەقڵی‌و سۆزداری‌و هەستپێکراوەکانی لەگەڵیدا بەکارهێناوە، لە شێوازە هەستپێکراوەکان ئەوەبوو کاتێ ئامۆژگاری دەکات بە نزم کردنەوەی دەنگ هاتووە چیرۆکێکی ماددی هەستپێکراو ناسراو و دیار لەلای کوڕەکەی باس دەکات بۆی. دەفەرموێ:﴿ **وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ** ﴾**لقمان**19. واتە: (دەنگت نزم بکەرەوە چونکە ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی

گوێدرێژه)، کاتێکیش ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات بە رووخۆشیو خۆ بە کەمزانو فیزنەکردن ئەوا شێوازێکی سۆزداری بەکارهێناوە لەگەڵیدا، دەفەرموێ: ﴿ **إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾لقمان**18واتە: (خوای گەورە کەسانی لووتبەرزو فیزاویو خۆبەزلزانی خۆش ناوێن)، پاشتریش شێوازێکی ماددی بەکاردەهێنێ ئەویش لە دووتوێی گوتەی: ﴿**وَلَا تُصَعِّرْ** ..﴾**لقمان**18، کە ئاماژەیەکی تێدایە بۆ نەخۆشیەك کە پێی دەوترێ روو وەرگێڕان (العصاد)و تووشی حوشتر دەبێت کە قەپۆسی بەرز دەکاتەوەو سەری بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمانو پاشان دایدەنەوێنێ، هەروەك بڵێی ئەو کەسەی کە خۆی بە زل دەزانێو قەپۆسی بەرز دەکاتەوەو روو لە خەڵکی وەردەگێڕێو خۆی لە سەرووی خەڵکیەوە سەیر دەکات ئەوا وەك ئەو حوشترە وایە کە پاشتر تەختی زەوی دەبێت، ئەمە بە تەنیشت ئەوەوە کە ئاماژەیەکە بۆ نەخۆشی خۆ بەزلزانی، کە ئەویش نەخۆشیەکی کوشندەیەو وەك قەپۆس لێدانو روو لە خەڵکی وەرگێڕان وەهایە.

لێرەوە دەڵێین ئەوە زانستو فیقهی بانگخوازە پاڵی پێوە دەنێ بۆ بەکارهێنانی شێوازی گونجاو، کە دڵی بانگکراوی پێ دەکاتەوە.

<u>**کاری سێیەم:**</u> میتۆدی گەیاندنی بانگەواز، یان میتۆدی گوتاری بانگخوازی:

لە راستیدا میتۆدیبوون یان گرتنەبەری میتۆد مەرجێکی سەرەکییە بۆ سەرکەوتنی هەر پرۆژەو کارێك، لەبەرئەوە بانگەواز لە ئەمرۆدا پێویستیەکی ئێجگار زۆری هەیە بە میتۆدێکی روون کە پشت ببەستێ بە پرنسیپە نەگۆڕەکانی ئیسلام لە باوەڕو لە رەوشتو لە پەرستشتەکاندا، وە لەسەر ئەو

گۆڕدراونە کە گەشە بە زانست دەدەنو وای لێدەکەن کە کاریگەری زۆرتری هەبێو بەهێز بێت.

ئەو میتۆدە ئەوە دەخوازێ بانگخواز پلانێکی ڕۆشنی هەبێ کە ئامانجی بانگەوازەکەیو دیدو تێڕوانینو هۆکارو سەرچاوە خوازراوەکانی دیاری کردبێ تیایدا، ئەو ئاستەنگانەی دەستنیشان کردبێ دەبنە ڕێگر لە بەردەم بانگەوازەکەیدا، هاوکات ئەو دەرئەنجامانەی کە لە بانگەوازەکەیدا بەدەستیان دەهێنێ.

بەڵام لەسەر ئاستی دامەزراوە بانگخوازیەکان، یان ئوممەت ئەوا دەبێ پلانێکی ستراتیژی تۆکمەی هەبێ، پڕاوپڕ مانای ئەم وشەیە بگەیەنێ، بۆ گەیشتن بەو دەرئەنجامانە کە لە سەرەتاوە لەبەرچاوی گرتوون، بەتایبەتی خۆڕاگر بێت لەبەردەم ئەو ئاستەنگانەدا کە لە بەردەم بانگەوازەکەدا دادەنرێن، هەروەها لەبەردەم مەترسیەکانی پرۆسەی بەگاورکردنو گومڕاکردنو بیدعەو شتە پڕوپووچەکان.

ئێمەش لێرەدا گرنگترینی بنەما سەرەکیەکانی ئەو پلانە یان ئەو میتۆدە باس دەکەین کە ئەمانەی خوارەوەن:

1- دەبێ بانگەواز لەسەر ئەو پرنسیپە نەگۆڕانە بونیاد بنرێ کە کۆدەنگی تەواوی ئوممەتی لەسەرە، هاوکاتیش لەسەر پرنسیپە گۆڕدراوە ئەرێنیەکانیش (لەسەر ئیجتهادەکانو ناوچەی لێبوردن) بۆئەوە بتوانێ هەردوو چەمکی ڕەسەنایەتیو سەردەمی لەخۆیدا کۆ بکاتەوە، ئەو ڕەسەنایەتیەی کە ئوممەتی ئیسلام دەپارێزێ لە توانەوەو بەتالاّن بردنی ژیاری، ئەو سەردەمیەی کە دەبێتە مایەی پەرەپێدانو گەشەکردنو میانەییو ئاسانکاری.

2- دەبێ پلانی بانگەواز لە رووی دیدو تێڕوانینەوە، لە رووی پەیامو ئامانجو پێکهاتەکانەوە، لەرووی دەرئەنجامو ئاسەوارەکانەوە، لەسەر (میتۆدی میانڕەوی‌و هاوسەنگ بونیاد بنرێ کە لەسەر ئاسانکاری‌و پلەبەندی‌و هەڵگرتنی بیانووی تەنگەتاوی لە تاوان کردندا بەرپا دەبێ)، وە لەسەر کاری دامەزراوەیی رێك‌و پێك کە ئیسلام خۆی لە پەرستش‌و حوکمە شەرعی‌و پایە سەرەکیەکانیدا فێری کردووین، تەنانەت لە گوتاری تاکەکەسیشماندا کە ئاراستەی خوای گەورەی دەکەین: **إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، اهدِنَـــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ** **الفاتحة**(5-6) واتە: بە لەفزی کۆ بێت لەکاتێکدا کە دوعاکارەکە خۆی تاکە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا تاکەکەس رابێت لەسەر کاری کۆمەڵیانەو دامەزراوەیی.

3- دەبێ گوتاری بانگخوازی لەسەر فیقهی هاریکاری‌و کۆبەندی‌و ئەدەبی جیاواز لە ڕادا بونیاد بنرێ، هاوکات ئیجتهادو رای ئەویتری لا پەسەند بێت مادامێ دژنیە لەگەڵ دەقێکی رۆشن‌و رووندا کە مانای تر هەڵناگرێ، چونکە ئەوەی کە لە ئیسلامدا کۆ دەنگی لەسەرە ئەوەیە کە ئەگەر کۆشتکار (مجتهد) راکەی پێکای ئەوا دوو پاداشتی چاکەی هەیە، وە ئەگەر راکەیشی مەبەستی راستی نەپێکا ئەوا یەك پاداشتی چاکەی هەر هەیە.[1] جا کەوایش بوو ئەوا نابێ بانگخواز بێت ڕا جیاوازو گرفتدارو ناکۆکیەکان، یان ئەومەسەلە جیاوازانە بوروژێنێ کە فیتنەیان لێ دروست دەبێ، لێرەوە شیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: (میتۆدی ئەهلی سوننەت‌و جەماعە ئەوەیە ئەوکەسەی کۆششکارە لەڕاداو موجتەهیدە ئەوا ئەگەر هەڵەیش بکات هەر تاوانبار نابێت)[2].

[1] البخاري / 7352

[2] الفتاوى لابن تيمية/123/19

هەروەها دەڵێ: (بەهۆی ئەو مەسەلانەوە کە چەندین تێگەیشتن هەڵدەگرنو فراوانن لەڕادا، ئەوا ڕەوا نیە پەنا ببرێتە بەر ئابڕو بردنو لەقاندنو پێگە هەڵتەکاندنی بەرانبەرەکە... هەرکەس لەباوەڕداران ئیجتهاد بکات لەداواکردنی مافی ڕەواداو هەڵە بکات ئەوا با هەرکەس بێتو با هەڵەکەی هەرچی بێت خوای گەورە لەهەڵەکەی خۆش دەبێت، ئیتر ئەو ئیجتیهادە لەمەسەلە تیۆریو ئیجتیهادیەکاندا بێت یان لەمەسەلە بەشیو لاوەکیە زانستیەکاندا بێت چوون یەکە، هەڵەکەیش هەروەهایە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و جەماوەری ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەم ڕاو بۆچونە بوون)[3].

4- دەبێ ئەو بانگەوازە ڕەچاوی فیقهی هاوسەنگیەکان (موازنات) لەنێوان هەندێك لەگەڵ هەندێکی تری بەرژەوەندیەکاندا بکات، هاوسەنگی لەنێوان هەندێك لەگەڵ هەندێکی تری شتە خراپەکاندا بکات، لەنێوان بەرژەوەندیەکانو شتە خراپەکاندا لەرووی هێزو لاوازییەوە، لەرووی پەیوەندیانەوە بەتاکەکەس یان کۆمەڵ یان کۆمەڵگاو ئوممەتەوە.

هەروەها دەبێ ڕەچاوی فیقهی لەپێشترو گرنگتر بکات لەهەر شتێکدا کە پەیوەندی بەبانگەوازەوە هەیە ئیتر ئەوانەیان کە پەیوەندیان بەبابەتەکانی بانگەوازەوە یان بانگکراوەکانەوە هەیە یان پەیوەندیان بەشێوازەکانەوە هەیە، بەجۆرێ کە دەبێ ڕەچاوی گۆڕینی لەپێشتری تاکەکان لەپێش ڕژێمەکانەوە بکرێت، ڕەچاوی لەپێشتری جەنگی هزری لەپێش هەرجەنگێکی تردا بکرێت، لەپێشتری زانستێك بەسەر زانستێکی تردا، لەپێشتری مەبەستەکان بەسەر شتە ڕواڵەتیەکاندا، لەپێشتری مەسەلە

---

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو

گومانبڕو بەڵگەدارەکان بەسەر مەسەلە گوماندارەکاندا، بۆ مەسەلەکانی تریش هەربەهەمان شێوە بێت[4].

5- دەبێ لە مەسەلەی بانگخوازی یان میتۆدی بانگخوازیدا بەخەستی جەخت بکرێت لەسەر گۆڕانکارییەکی گشتگیر لەدەرونو دڵو رۆحو ژیریەکانداو بەرەو باشتر بوون ببرێن، هاوکات جەخت بکرێت لەسەر پلانێکی چاکسازی گشتگیر، چونکە ئەم شتانە گرنگترین شتانێکن کە قورئانی پیرۆز گرنگیان پێدەداتو جەختیان لەسەر دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ** ... ﴾**الرعد**11. واتە:" خوای گەورە گۆڕانکاری لەوحاڵەتەدا ناکات کە خەڵکی وان تیایدا هەتا نەیەن ئەوەی وا لەدەرونیاندا بیگۆڕن".

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**﴾**الأنفال**53. واتە:" خوای گەورە بارودۆخو نازونیعمەت لەهیچ قەومێك تێك ناداتو نایگۆڕێت هەتا ئەوان ناخی خۆیان نەگۆڕن".

ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە لەئوممەتو ژیارو دەوڵەتاندا کە هەموو کارەکان پەیوەستن بە گۆڕانی دەروونەکانەوە جائەگەر خێرو چاکە بوو ئەوا خێرو چاکە دێتە رێگای، وە ئەگەر خراپەکاریش بوو ئەوا خراپە دێتە رێگای.

لەبارەی چاکسازیشەوە ئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو پێغەمبەران بوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ** ﴾**هود**88.

---

[4] فقه الاولويات/د. يوسف القرضاوي/ل/220

هەروەها دەبێت ئەو پلانە لەسەر(گشتگیری ئیسلام بۆ سەراپای ژیان) دامەزرابێت، خوای گەورە دەفەرمویت: **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ ...الأنفال24**. واتە" ئەی ئەو کەسانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە، بەگەرمو گوڕیەوە بچن بەدەم بانگەوازو فەرمانەکانی خوای گەورەو پێغەمبەرەوە کاتێك کەبانگتان دەکات بۆ بەرنامەو رێبازێك کە ژیانتان پێ دەبەخشێت، ناخو دڵو دەرونتان دەبوژێنێتەوە". دەفەرمویت: **قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الأنعام162**. واتە" ئەی موحەمەد بڵێ: لەراستیدا من نوێژەکانم، سروتەکانم  لەحەجو عەمرەدا، بەڵکو سەرجەم چالاکیەکانم  هەروەها ژیانم بەتەواوەتیو خۆ ئامادەکردنیشم بۆ مردن، هەرهەمویم خستوەتە چوارچێوەی بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو خوایە کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە".

هەروەها دەفەرمویت: **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ البقرة208**. واتە" ئەی ئەو کەسانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە هەرهەموتان بچنە ژێر سایەی ئایینی ئیسلامەوەو هەموو لایەنەکانی پیادە بکەن، مەبەستی سەرەکیتان ببێتە بەرپاکردنی ئاشتیو ئاشتەوایی لەکۆمەڵگادا، نەکەن شوێن پلانو نەخشەو هەنگاوەکانی شەیتان بکەون، چونکە بەراستی ئەو دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە" .

زانایان ئەم ئایەتەی سەرەوەیان بەوە راڤە کردوە کە دەبێ(پابەند بوونی تەواو هەبێت بەهەموو حوکمەکانی ئیسلامو یاسا شەرعیەکانیەوە، بەهەموو فەرزەکانیەوە بەبێ هیچ هەڵاوێرکردنێك)[5]

---

(5) تفسيرى الطبري/2/429-434.

لێرەوە هیچ ڕەوا نیەو نابێت بازنەی بانگەواز سنوردار بکرێت لەفەرزەکانو بەشی پاكو خاوێنیدا، یان تەنانەت لەباوەڕو ڕەوشتدا بەتەنها، بەڵکو دەبێت بانگەواز سەراپای لایەنە زیندوەکانی ژیان بگرێتەوە، بەجۆرێکی وەها دەبێ بانگەواز ئاراستە بکرێت بۆ چاکسازی لە سیاسەتدا بەوەی کە لەسەر شوراو دادپەروەریو یەکسانی لەمافو ئەرکەکاندا دابمەزرێت، گەلان مافی خۆیانە بەوپەڕی ئازادیو ڕاشکاویو ڕوونو ئاشکرا نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن، هاوکات هەر ستەمێکی سیاسیش ڕەت بکەنەوەو ڕێگری لێ بکەن.
هەروەها دەبێ ئەو پلانە بانگەواز بۆ چاکسازی لەسیستمی ئابوریدا بکاتو لەخۆی بگرێ، ئەویش لەدوو توێی بەرنامەیەکی ئابوریی پشت بەستوو بە ئیسلام کە کێشە ئابورییەکانی سەردەم لەهەژارییو بێکاریی چارەسەر دەکات، هاوکات گەشەپێدانێکی گشتگیر دەستەبەر بکاتو لەسەر چالاککردنی ئابوریی لەنێو جیهانی ئیسلامیدا دابمەزرێ، بەجۆرێ ئەو ئابورییە ببێتە هۆکارێکی بەهێز بۆ یەکبوونی سیاسیمان هەروەك چۆن ئەوروپا ئەوکارەی بۆ خۆی ئەنجامدا.
بەهەمان شێوە دەبێ ئەو پلانی بانگخوازییە کێشەو مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان لەخۆ بگرێو بچێتە نێو قوڵایی کێشەکانەوەو چارەسەری گونجاویان بۆ دابنێ.
هەروەها دەبێ ئەو بانگەوازە هەموو بەرپرسە سیاسیەکان بگرێتەوە هەروەك چۆن دەبێ هەموو خەڵکانی تریش بگرێتەوە، هەروەك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دەفەرموێت: (ئایین دڵسۆزییە) وتمان بۆ کێ. فەرمووی(بۆ

خوای گەورە، بۆ پەڕاوەکەی، بۆ پێغەمبەرەکەی، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانو گشت خەڵکانی تریشە"[6].

زۆر جار جەختم لەسەر کردوەو دوپاتم کردوەتەوە[7] کە دەبێ زانایانی بانگخواز لەجەستەی ئوممەتدا وەك دڵ وابن، دڵ خوێنی پاك دەنێرێ بۆسەرو بۆ کۆئەندامەکانی تری جەستە، هەروا زانایانی بانگخوازیش دەبێ پەیوەندیدار بن لەگەڵ سیاسەتمەدارانو کەسانی بڕیار بەدەستو بەرپرساندا، ئامۆژگاریو رێنمایی کار بن بۆیان، ئەویش بەگوتەی هەقو راستو بەحیکمەتو ئامۆژگاری چاك بەدەمیانەوە بنو کەمتەرخەم نەبن بەرانبەریان، بۆ جەماوەریش بەگشتی دەبێ بەئامۆژگاریو بەپەروەردە کردنیانەوە خەریك بنو فەرامۆشیان نەکەن.

6- دەبێ ئەو بانگەوازە هەڵگری ئاشتەوایییەکی سەرتاسەری بێت لەنێوان گەلانو فەرمانڕەواکانیدا، وەلەنێوان هەموو گروپو کۆمەڵە ئیسلامیەکاندا کە لە گۆڕەپانی ئیسلامیدا کار دەکەنو کاران، بەڵکو دەبێت ئاشتەوایی هەبێت لەنێوان هەموو حیزبو کۆمەڵەکانو ئەو بیرمەندانەدا کە لە بنەڕەتدا سەر بەئیسلامن، بەلاّم لەتێگەیشتنیاندا بۆ ئیسلام کەمو کوڕییەك هەیەو دوورە پەرێزی کردون.

دەبێ بانگەواز کار بکات لەسەر دەستەبەر کردنی ئاشتەوایییەکی گشتگیرو سەرتاسەری ئەویش لەرێگای گوتارێکی گشتگیرو لەسەرخۆو هێمنو ئامانجداری پەسەندەوە، بەجۆرێ هەرهەموان هاوکاری یەکتر بکەن لەو شتانەدا کە هاوڕانو رێکن لەسەری، لەوشتانەو مەسەلانەشدا کە هاوڕانینو رایان جیاوازە لەسەریان

[6] رواه مسلم/55.
[7] كلمة للمؤلف في الدورة الثالثة للجمعية العمومية للاتحاد العالمي لعلماء المسلمين في اسطنبول(29-2010/7/31)

بالێبوردەبن‌و لەیەکتری ببورێن، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدەین بۆ گەیشتنە تێگەیشتنێکی هاوبەش لەسەر حەقیقەتی ئیسلام‌و بنەما نەگۆڕەکانی.

7- دەبێ ئەو پلانی بانگخوازییە بانگەواز بۆ هاوکاری‌و یارمەتیدان لەسەر چاکەو پارێزگاری‌و لەخواترسان بکات، بەڵکو هاوبەشی‌و بەشداری کردن لەکاری چاکەدا لەخۆ بگرێ، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی هەموو لایەك دەستەبەر بێت، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەو هاوکاری کردنە کردوە بێ ئەوەی ئەو کەسە دەست نیشان بکات کە هاوکاری لەگەڵدا دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: **وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى** **المائدة**2.واتە" هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر کاری چاکەو پارێزگاری‌و لەخوا ترسان" .

فەرمانی کردوە هاوکاری لەسەر چاکەو لەخواترسان بکرێ‌و ئەو کەسەی دەست نیشان نەکردوە کە هاوکاری لەگەڵیدا دەکرێ، ئەمەیش ئەو تێگەیشتنەی لێ دەردەهێنرێت کە هاوکاری کردن لەگەڵ هەمواندا رێگا پێدراوە بەچاوپۆشین لەو کەسە هاوکاری لەگەڵیدا دەکرێ‌و تەنها یەك مەرج دانراوە بۆ ئەو هاوکارییە ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەو هاوکارییە لەسەر چاکەو پارێزگاری‌و لەخواترسان بێت، هەرلێرەوە بەهیچ جۆر نابێ هاوکاری هەرکەسێکی تر بکرێ لەسەر تاوان‌و دەستدرێژی کردن‌و ستەم‌و ملهوڕی، بائەوکەسەیش مسوڵمان بێت.

8- هەتا ئەوپەڕی بایەخ‌و گرنگی بەخەم‌و مەینەتیەکانی ئوممەت بدرێ، ئەو نەخۆشیانە دەست نیشان بکرێت کە تاك‌و کۆمەڵگا ئیسلامیەکان پێیانەوە دەناڵێنن، هاوکات سوود وەربگرێت لەو سەرژمێرییە وردو راستانە کە لەلایەن پسپۆڕەکانەوە دەردەچن.

بۆ نمونه زۆربەی کۆمەڵگاکانمان دووچاری مەینەتیەکانی بێکاریی‌و هەژاریی‌و، نەخۆشی‌و هەلاوسان، قەیرەیی، وەچەندین گرفتی کۆمەلایەتی‌و ئابوری ترو چەندین مەینەتی تریش هاتوون، جاکەوابوو دەبێ پلانی بانگخوازیمان گرنگی بدات بەچارەسەر کردنی ئەو نەخۆشیانە لەسەرجەم لایەنی رۆحی‌و زانستی‌و ناوخۆیی‌و ناوچەییەکانەوە، هەولبدرێ لەرێگای پرۆژەو بەرنامەکانەوە رێگا چارەی گونجاویان بۆ دابنرێ، ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین کە دامەزراوە موژدە دەرەکان (بەگاورکەرەکان) لەجیهانی ئیسلامیدا بەتایبەتی لەئەفەریقادا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ئەویش لەرێگای کردنەوەی پرۆژەی فێرکاری‌و ئابوریی‌و تەندروستی‌و مرۆییەکانەوە، هەروەك دەوترێ: گومانی تێدا نیە کە دەبێ قۆرەی گەدەی خالی ببیسترێ، خنکاویش خۆی هەلدەواسێ بەچلە پوشێکەوە.

ئای کە چەندە نارەحەتم‌و دلم ئازاری پێ دەگات‌و چاوم فرمێسك دەرێژێ کاتێ دەبینم کە برسێتی لەسۆمالدا چ کەتنێك‌و نەهامەتیەك بەسەر ئەوگەلەدا دەهێنێت، دەبینم مندالانی شیرەخۆرە دەمرن، پیرو بەسالاچوانی پشت کۆماوە کەسێ بەدی ناکەن رزگاریان بکات لەمردن، بەلکو ئەوەتا چوار ملیۆن کەس بەهۆی برسێتیەوە هەرەشەی مردنیان لەسەرە، کەچی لەگەل هەموو ئەوەشدا هەر شەرو کوشتار لەنێوان حکومەت‌و کۆمەلە ئیسلامیەکاندا گری گرتوە، کە گرنگترین هۆکاری ئەو برسێتیە دەگەرێتەوە بۆ ئەو شەرو کوشتارە کە دەیان سالە بەردەوامە، خوای گەورە یارمەتی دەرو پشت‌و پەنا بێت.

9- رەچاوکردنی سوننەتی پلەبەندی، پشت بەستن بەفیقهی موژدە دان لە بانگەوازداو ئاسانکاری کردن لەروونکردنەوەی حوکمە شەرعیەکاندا، هاوکات

بەبەزەیی‌و بەسۆزداری مامەڵە بکرێ لەگەڵ هەمواندا دوور لەحوکمدان بەسەر کەسانی تردا کە تاوانبارو خراپەکارن یان بەکافر کردن، بانگخواز هەروەك لەپێشەوە وتمان وەك پزیشك وەهایە، بۆیە دەبینین کە پێشەوا هوزەیبی لەبەرپەرچدانەوەی کۆمەڵەی تەکفیرو هیجرەتدا ناونیشانی کتێبەکەی بریتیە لە: بانگخواز بوون نەك دادوەر بوون (دعاة لاقضاة)، پاشتر بۆیان روون دەکاتەوە کە ئەوان بانگخوازی بەبەزەییی‌و فەرمانڕەواو کاربەدەست نین تابێن بەبێ بەزەیی سزا شەرعیەکان جێبەجێ بکەن[8] .

10- دەبێ لەو میتۆدو پلانەدا بەوردی‌و بەدرێژی رەچاوی شەرعیبونی جیاوازییە گرنگەکان لەنێوان بانگەواز لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامی، وەبانگەواز لەناو کۆمەڵگایەکی غەیرە ئیسلامیدا بکرێت، چونکە[9] بۆهەریەکێکیان تەرازویەکی شەرعی جیاواز بەخۆی هەیە، لێرەدا بواری ئەوە نیە بچینە نێو وردەکاری.

[8] فقه الاولويات، الصحوة الاسلامية، لمؤلفها د.يوسف القرضاوى

[9] **کتێبی (ئێمەو ئەوان)، د.عەلی قەرەداغی**

## مەرجەكانی سەركەوتنی بانگەواز

بەمەبەستی سەركەوتنی بانگەوازو پلانەكەی كۆمەڵە مەرجێك هەن دەبێ لەبەرچاو بگیرێن، كە بریتین لەمانەی خوارەوە:

1- دەبێ كەسانی دڵسۆزو پسپۆڕ- وەك پێشتر باسكراوە  هەستن بەكاری بانگەوازو سەرپەرشتی دامەزراوەكانی بكەن، ئەمەیش مەرجی سەرەكیو یەكەمینە، خوای گەورە دەفەرمویێت: **وَإِن يُرِيدُوا أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللّهُ هُوَ الَّذِيَ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ الأنفال**62. واتە" تۆ- ئەی پێغەمبەر- خوای گەورەت بەسە كە پشتیوانو یارو یاوەرت بێت، هەر ئەو زاتە پشتیوانی لەتۆ كردوەو سەركەوتنی تایبەتی لەرێگای ئیماندارانەوە پێ بەخشیویت".

لەگرنگترین هۆكارەكانی سەركەوتن ئەوەیە كە بانگخوازن خاوەنی پەیام بنو خەمو زەحمەتەكانی بانگەواز هەڵبگرن، بۆ ئەو بژینو لەگەڵ بانگەوازدا بژین، نابێت وەك كارمەندێكی موچە خۆر هەڵسوكەوت بكەن، دەبێ لەپاش ئەمە هەوڵی دەستەبەر كردنی سەرچاوە داراییەكان بدرێتو ئاستەنگەكان نەهێڵدرێن.

2- دەبێ لەلایەن بانگەوازەوە (یان دامەزراوەی بانگەوازیەوە) بەدواداچونی بەردەوام هەبێت بۆ بانگەوازەكەیو بۆ كارەكەیو بۆ بانگكراوەكان، لەگەڵ چاودێری كردنو لێپرسینەوە لەهەر كەمتەرخەمیەك یان هەڵەیەك، هاوكات پێداچونەوەیەكی وردو ناسكو بەردەوام بكرێ، چونكە ئەم كارە دەبێتە هۆی توندوتۆڵ بوونو بەهێزیو سەركەوتنی بانگەوازو ئاشنابوون بەهۆكارەكانی هەر هەڵەیەكو دواجاریش چارەسەر كردنی.

3- دەبێ بانگخواز(یان دامەزراوەی بانگخوازی) هەستێ بەجێبەجێکردنی پرۆسەی نوێبونەوەی بەردەوام لەبانگەوازو لەشێوازەکانیدا.

4- دەبێ بانگخواز (یان دامەزراوەی بانگخوازی) هەوڵبداو تێبکۆشێ بۆ بەرەو باشترو چاکتر ئەویش لەرووی (شێوازو میتۆدەوە)، لەرووی بابەتو جۆری خستنە پێش چاوو نمایشکردنەوە.

بەمجۆرەش داهێنانو پەرەپێدان دەستەبەر دەبێت خوای گەورەش فەرمانی پێکردوین کە چاکترینی کار ئەنجام بدەین لەهەموو شتێکدا، بۆ گرنگێتی داهێنان کردن لەهەموو کارێکدا لەفەرمودەیەکدا بۆمان روون دەکاتەوەو دەفەرمویت:﴿... **لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ** ﴾**الملك**2. واتە"لەدنیادا تاقیتان دەکاتەوە تادەربکەوێ کە کامەتان لەهەموو بوارەکانی ژیاندا کاری چاکترو باشتر دەکات، بەم پێیە ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ تاقیکردنەوە لەسەر کرداری چاکتر نەك بۆ کارێکی ئاساییو سادە بێت، تەنانەت ئەو تاقیکردنەوەیە بۆ چاکەیش نیە، بەتایبەتی کە (أحسن عملا) بەنەناسراوی (نکرة) هاتوە تاببێتە ئاماژەیەكو ئەو مانایە بدات کە چاکتر بەپێی سەردەمێ بۆ سەردەمێکی تر، وە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێ، بۆ نمونە چاکترین کار لە ئەمڕۆدا هەمان چاکترین کاری دوێنێ نیە، هەروەها بۆ سەردەمو شوێنەکانی تریش، هەر لەم ئایەتە پیرۆزەوە ئەوە تێدەگەین کە گرنگێتی بدرێ بەبەردەوامبونی چاکترینو بەپەرەپێدانی.

فەرماندان بەچاکترین کار یان ئاماژەدان بەگرنگێتیەکەی لەزیاد لەئایەتێکی پیرۆزدا دووبارە بوەتەوە، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿**وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**﴾**النحل**125. واتە" بەچاکترین شێوەو بەچاکترین باس مشتومڕ لەگەڵ

بێ باوەڕاندا بکە" هەروەها دەفەرموێت: ﴿**وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيباً**﴾**النساء**86.واتە"هەرکات سەلامتان لێکرا ئەوا ئێوەیش بەچاکتر لەو سەلامە وەڵامیان بدەنەوە یان بەلانی کەمەوە هەروەك خۆی وەڵامی بدەنەوە". دەفەرموێت: ﴿**وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ**﴾**الأنعام**152. واتە" بەهیچ جۆر نزیکی ماڵی هەتیو نەکەون، ئەگەر بەناچاریو لەبەر دڵی ئەوان کەوتیتە حاڵەتێکەوە شتێکی کەم لەماڵیان بخۆیت ئەوا دەبێت لەبەرانبەرەوە هەستیت بەقەرەبوو کردنەوە بەچاکترین شێوەو زیاد لەوە ببەخشیتەوە پێیان ئیتر بەماددی یان بە مەعنەوی بێت..." وەدەفەرموێت: ﴿**ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ**﴾**المؤمنون**96. واتە" ئەگەر خراپەیەکت لەگەڵدا کرا ئەوا دەبێ بەچاکترین شێوەو بەچاکە وەڵامی بدەیتەوە".

هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿**وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**....﴾**الإسراء**53. واتە" فەرمان بەبەندەکانم بکە کە بەچاکترین شێوازو چاکترین گوفتار قسە بکەن" هەروەها دەفەرموێت : ﴿**وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم** ....﴾**الزمر**55. واتە" بەچاکترین شێوە شوێنکەوتەی ئەو قورئانە بن کە لەپەروەردگارتانەوە دابەزیوەتە سەرتان" هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا** ... ﴾**الأعراف**145. واتە" ئەی موسا فەرمان بەقەومەکەت بدە با بەچاکترین شێوە پەیڕەوی بکەن". کەوابوو لەم ئایەتە پیرۆزانەی سەرەوە ئەوە تێدەگەین تاج مەودایەکی دور پەروەردگار بەپەرۆشە

لەسەر چاكترینی كارەكانو فەرمان بە پێغەمبەرەكەشی دەكات بامیتۆدی كاریان گەیشتن بێت بەچاكترین كار لەهەمووو شتێكدا تاببنە شایانی ئەوە كە: **كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ...آل عمران110**. واتە" چاكترین ئوممەتانێكە كە نێردرابن بۆ خەڵكی.

5- دەبێ بانگخواز كەسێكی كراوە بێت لەسەر ئەوانی تر، وەلەسەر كلتوری رۆشنبیریان، دەبێت وەك هەنگ وابێت كە دەچێ لەجۆرەها گوڵو گوڵزار شیلە وەردەگرێ.

## كۆتاییو چەند راسپاردەیەك

لەپاش ئەم چەند گەشتە وەسفكارە لەدەریای فیقهی بانگەوازدا لەروانگەی قورئانو سونتەتەوە، توێژینەوەكە ئەم چەند راسپاردەیەی خوارەوەی لێ دەكەوێتەوە:

1- دەبێ گرنگی بدرێ بەدانانی پلانی قۆناغ بەندیو ستراتیژی بۆ بانگەواز بۆلای خوای گەورە لەنێوان جیهانی ئیسلامیدا كە دیدو تێڕوانینو ئامانجو پەیامو بەرنامەو پرۆژە تایبەتیەكانی بەخۆی هەبێت، هەروەها پلانی قۆناغ بەندیو ستراتیژی كە لەسەر حیكمەتو دانایی دامەزرابنو دابنرێن، هاوكات بەچاكترین شێوازو چاكترین باس وتوێژ لەگەڵ جیهانەكەی تردا بكرێ.

2- پێویستە هەوڵەكان چڕبكرێتەوەو جەخت بكەن لەسەر دانانی میتۆدێكی فیكری روونو رۆشن، هەروەها بەرنامەیەكی پراكتیكی كە دامەزرابێت لەسەر ئاینی ئیسلام بەواتا گشتگیرەكەیەوە دابنرێو بەفیعلی ئەوە بخاتە

روو کە ئاینی چارەسازو چاکەیە، بەزەییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، ئەویش بەشێوازێ بێت کە غەیرە مسوڵمانەکان بەروونی لێی تێبگەن: ﴿**وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا**﴾**البقرة**189.

3- بانگەشە بکرێ بۆ کۆنگرەیەکی جیهانیو تایبەت بکرێ بەدانانی میساقو بەڵێننامەیەك لەنێوان بانگخوازاندا بەتایبەتی بۆ بزوتنەوەو کۆمەڵە ئیسلامیەکان، ئەو بەڵێننامەیە بەرپا بێت لەسەر قوڵکردنەوەی چەمکەکانی پێکەوە ژیانو لێبوردەییو هاوکاریو یارمەتیو هاوبەشی لەنێوان بانگخوازانو دامەزراوە بانگخوازییەکاندا، با ئەو میساقەش بەشێوەی هەنگاو وپلەبەندی بێت.

لەهەمان کاتدا ئەوە تێیدا تاوتوێ بکرێت بڕوانامەیەکی بانگخوازی دابنرێ کە لەسەر پرنسیپە نەگۆڕەکانی ئیسلام دامەزرابێتو گشگیر بێت، لە دووتوێی ئەو بەڵگەنامەیەدا پلانێکی ستراتیژی بۆ بانگەواز بۆلای خوای گەورە لەنێوان جیهانی ئیسلامیو لە دەروەیدا هەبێ، بناغەو بنەما خوازراوەکانی لەخۆگرتبێ.

4- بانگەواز کردن بۆ زیاتر پابەند بوونە بەئەدەبی رای جیاوازەوە، وە بەفیقهی هاوپەیمانیو پێکەوە ژیانەوە.

خوای گەورە یارمەتیدەرو پشتیوان بێت

کۆتا نزامان سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیانە